# به ناوی ئافرێنەری بوون

## پێشەکی

**حاڵەتە لەناکاوەکان (ئیمێرجینسیەکان)هەموو ڕۆژێک لە هەموو شوێنێک ڕوودەدەن. کاریگەرییان لەسەهەموو کەسەکان هەیە بەتایبەتیش( گەورەساڵان و منداڵان ). ئەو حاڵەتانەی ئەگەری هەیە ڕوبدەن بریتین لە ( جەڵتەی دڵ و جەڵتەی مێشک، بریندداربوون و هەوکردن و ئاڵۆزییە توندەکانی دووگیانی و نەخۆشییە درێژخایەنەکان)**

**ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیی، بە هاوکاری لیژنەی نێو دەوڵەتی خاچی سور وە فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی بۆ پزیشکی فریاگوزاریی ، خولی چاودێری فریاگوزاری سەرەتاییان بۆ کەسانی هێلی پێشەوە کە ئەو گروپانە دەگرێتەوە کە حاڵەتە مەترسیدارەکان بەڕێوەدەبەن ئەنجامداوە کە ئەوانیش بریتین لە (پزیشکان، پەرستاران، ئەفسەرانی کلینیکی...هتد).لەبەر نەبوونی سەرچاوەی پێویست دەربارەی فریاگوزاری سەرەتایی بە زمانی کوردی بە پێویستم زانی کاری وەرگێڕان بۆ ئەم پەرتوکە بکەم من وەک پەرستار هەوڵم داوە ئەم کارە ئەنجام بدەم کە ئەرکێکی گرنگ و بەرچاو دەبینێت لە بواری فریاگوزاری سەرەتایی بۆ حاڵەتە لەناکاو و مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان ، مەبەستیش لێی زیاتر شارەزارکردنی خوێندکاران و کارمەندانە بە فریاگوزاری سەرەتایی و یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە ژیانیان لە مەترسیدایە بە زمانی شیرینی کوردی .ئاشکراشە کە هیچ کارێکی زانستی هەروا ئاسان دەستەبەرنابێ و بێ گیرو گرفت نابێ تا گەیشتن بە ئەنجام. لەم پەرتوکەدا تەواوی ئەو زانیاریانەی کە بۆ ڕزگارکردنی ئەو کەسانەی ژیانیان لە مەترسیدایە ، دووبارە سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای گەورە کە کۆمەکی کردم بۆ تەواوکردن و بەئەنجام گەیاندن لە وەرگێڕانی ئەم پەرتوکە داواکارم لە خوای گەورە بیکاتە مایەی سود و نیەتم پاراو بکاتەوە تەنیا بۆ خۆی .**

**لە کاتی بوونی هەر پێشنیار و ڕەخنەیەک بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە دەتوانن پەیوەندی بە پەڕەی ئینستاگرامەکەمەوە بکەن:**

Nr_kurdishinfo

**شیماء جمال عبدالقادر**

**دەرچووی بەشی پەرستاریی زانکۆی ڕاپەڕین**

# Chapter 1: The ABCDE and SAMPLE history approach

## ئامانجەکان

### لەم چاپەتەرەدا زانیاری وەردەگریت دەربارەی:

- ئەو مەترسیانەی کە پێویستە لەبەرچاو بگیرێن لەکاتی نزیکبوونەوە لە کەسێکی نەخۆش یان بریندار
- چی پێیویستە بۆ نزیکبوونەوە لە کەسێکی نەخۆش یان بریندار بە سەلامەتی
- پێکهاتەکانی ABCDE
- هەڵسەنگاندنی بۆری هەوا
- کەی پێویستە (airway devices) بەکاربهێنرێت
- (advanced airway management)
- هەڵسەنگاندنی هەناسەدان, و یارمەتیدانی هەناسەدان
- هەڵسەنگاندنی دۆخی شلە (سووڕی خوێن)
- ئیلیمێنتەکانی سامپڵ هیستریی و سامپڵ هیستریی نمونەیی پەیوەندیدار

# تێڕوانینی گشتی:

**نزیکبوونەوە لە هەموو نەخۆشێک بە شێوەیەکی سیستماتیکی دڵنیایمان پێ دەدات لەوەی کە بارودۆخە مەترسیدارەکانی ژیان بە خێرایی دەناسرێتەوە و گرینگترین کارەکان سەرەتا ئەنجام دەدرێن ،وە پێویستە هەڵسەنگاندنی سەرەتا تەنها چەند چرکەیەک تا چەند خولەکێک بخایەنێ.**

---

**ئامانجی((**ABCDE**))** **بریتییە لە دەستنیشانکردنی خێرای ئەو حاڵەتانەی کە مەترسی لەسەر ژیان دروست دەکەن؛ دڵنیابوون لەوەی کە بۆری هەوا بە کراوەیی دەمێنێتەوە؛ و دڵنیابوون لەوەی کە هەناسەدان و سووڕی خوێن گونجاوە بۆ گەیاندنی ئۆکسجین بۆ جەستە**

**ئامانجی((** SAMPLE HISTORY **))** **بریتییە لە کۆکردنەوەی خێرای مێژووی گرینگ بۆ بەڕێوەبردنی حاڵەتەکە**

---

# ڕەچاوکردنی سەلامەتی

**بەشێکی گرنگی ئەنجامدانی فریاگوزاری سەرەتایی بریتیە لە سەلامەتی خۆت و کەسانی دەوروبەرت.کەسی نەخۆش یاخود بریندار نەک ناتوانێت یارمەتی ئەوانی دیکە بدات بەڵکو دەبێتە نەخۆشێکی زیادەو ئەرکێکی دیکە زیاتر دەکات.**

**ڕەچاوکردنی سەلامەتیش بریتیە لەپشکنین بۆ:**

**یەکەم: مەترسیەکانی دەوروبەر لەوانە (ئاگر، سەرچاوەی کارەبایی ،ڕژانی ماددەی کیمیایی )چونکە لەوانەیە هەریەک لەمانە مەترسی لەسەر خۆت و کەسانی دەوروبەر دروست بکەن .لەکاتی ڕووداوی هاتوچۆدا ئایە شوێنەکە بە ڕووی هاتوچۆکردندا داخراوە؟ ئەگەر دەرمانی بینا بوو ڕووداوەکە ئایە سەلامەتە بچیتە ژورەوە؟وە ئەگەری دەرمانی بیناییەکە لەبەرچاوبگرە دوای ڕوودانی تەقینەوە، ئاگر کەوتنەوە یان بومەلەرزە,لە شوێنی تەقینەوە هەمیشە ئەگەری تەقینەوەی زیاتر لەبەرچاو بگرە.**

**دووەم : توندوتیژی**

**ئایە ئەگەر هەیە زیانت پێ بگات لە لایەن نەخۆشەکەوە یان لەلایەن کەسانی ترەوە؟ بۆ ئەو نەخۆشانەی شەڕانگێزن یان وروژاون پێش دەسپێکردن و یارمەتیدانیان داوای یارمەتی لە کارمەندانی پۆلیس یان ئاسایش بکە.**

**سێیەم:مەترسی توشبون بە نەخۆشی**

**ئایە ئەگەری بەرکەوتنت بە نەخۆشی گوازرەوە هەیە؟ بۆ نمونە (ئەنفۆنزا و تایی خوێن بەربون).**

## بەکارهێنانی کەلوپەری خۆپارێزی

سەرەتا کە لەنەخۆشەکە نزیک دەبیتەوە لەوانەیە هۆکاری نەخۆشی یاخود ڕووداوەکە نەزانیت ،هەر بۆیە بە بێ کەلوپەلەکانی خۆپاراستنی کەسی(Personal Protective Equipment)لە کەسەکان نزیک مەبەرەوە چونکە لەوانەیە بەرکەوتەت لەگەڵ هۆکاری نەخۆشی یاخود مادەیی کیمیای زیانبەخش هەبێت . بیرت بێت هەمیشە خۆت لە بەرکەوتن بە شلەی جەستە بپارێزە ، کە ئەمەش پێویستی بە دەسکێش و پارێزەری چاو دەبێت هەندێک جار لەوانەیە پێویست بە پۆشینی (Gown,mask)بێت. .بۆ هەندێک بارودۆخی وەک (گومانکردن لە بڵاوبونەوەی تایی خوێن بەربون یان دڵنیابوون لە بڵاوبونەوەی) پێویستت بە شێوازی خۆ پاراستنی تایبەت هەیە.

## پاکردنەوە

بەرکەوتن بە نەخۆشیە گواستراوەکان مەترسیەکی بەرچاوە ،هەربۆیە کەلوپەلی خۆپاراستنی کەسیی( personal protective equipment) بەکاربهێنە وە هەوڵ بدە دەستەکانت بشۆیت پێش و پاش بەرکەوتنت لەگەڵ هەر نەخۆشێک.بەڵام لەوانەیە شتنی دەستەکان بە بەردەوامی نەتوانیت ئەنجامبدەیت هەر بۆیە دەتوانیت (جێلی کهول یان جێلی پاککەرەوە) بەکاربهێنیت .لە بیری مەکە ئەو کەلوپەلانەی دووبارە بەکاردەهێنرێنەوە وە ڕووەکان بە باشی پێویستە پاکبکرێنەوە.

ڕەنگە پاککردنەوە پێویست بێت دوای بەرکەوتن بە هەندێک جۆری ماددەی کیمیایی (وشک یان تەڕ) و بە پێی مادده کیمیاییەکە وە ڕەنگە پێویست بکات شوێنەکە بشۆردرێت بۆ لابردنی . هەموو مادده کیمیاییەکان ناتوانرێت بە ئاسانیی بشۆردرێتەوە و هەندێکیان دەبێت بە شێوازی تایبەت لاببرێن بۆ ئەوەی زیان بە کەسەکە نەگەیەنێت. بۆ ئەمە پێویستە کەلوپەلی خۆپارێزی گونجاو بەکاربهێنیت.

### داوای یارمەتی زیاتر بکە ئەگەر پێویست بوو

ئەگەر چەند کەسێک بریندار یان نەخۆش بوون، پەیوەندی بکە بۆ یارمەتی یان کەسێک بنێرە بۆ ئەوەی پەیوەندی بکات ئەگەر چاودێری پێشکەوتوو پێویست بوو، هەرچی زووە دەست بکە بە ڕێکخستن بۆ ڕاوێژکاری یان گواستنەوە

دەزگا ناوخۆییە پەیوەندیدارەکان بناسە بۆ پەیوەندیکردن بۆ گومانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیە مەترسیدارەکان یان حاڵەتەکانی وەکو ڕژانی مادده کیمیاییەکان یان تیشکدەرەکان.

# ABCD APPROACH

**هەڵسەنگاندنێکی سیستماتیکیە بۆ دەستنیشانکردن و دەستێوەردانی خێرا بۆ حاڵەتە مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان بەکاردەهێنرێت.**

AIRWAY: **هەر بەربەستێک لە جوڵەی هەوا بۆ ناو سییەکان بپشکنەو چارەسەربکرێن.**
BREATHINH: **دڵنیابوون لە جوڵەی پێویست هەوا بۆ ناو سییەکان.**
CIRCULATION: **هەڵسەنگاندنی ئەوەی کە ئایا خوێنی پێویست هەیە بۆ گەیاندنی ئۆکسجین پشکنین بۆ نیشانەکانی خوێنبەربوونی مەترسیدار بۆ ژیان**
DISABLITY: **هەڵسەنگاندن و پاراستنی ئەرکەکانی مێشک و بڕبڕەی پشت.**
EXPOSURE: **هەموو برینداراەکان و هەڕەشە ژینگەییەکان دیاری بکە و نەخۆش لە دابەزینی پلەی گەرمی بپارێزە.**

**ئەم شێوازە بەکاردێت بۆ ئەوەی هەنگاو بە هەنگاو بارودۆخە مەترسیدارەکان بۆ ژیان زوو دەستنیشان بکرێن و چارەسەربکرێن، بە پێی لەپێشینە ئەگەر لە هەریەکێک لەوانە کێشەیەک بدۆزرێتەوە ، دەبێت راستەوخۆ چارەسەر بکرێت پێش هەنگاوی دواتر. دەبێت لە 5 خولەکی یەکەمدا ئەنجام بدرێت و دووبارە بکرێتەوە هەرکاتێک نەخۆش دۆخەکەی گۆڕا باشتر یان خراپتربوو.**

# هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردن

لەبیرت بێت..! هەمیشە پشکنین بۆ نیشانەکانی ترۆما(زەبر) بکە لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی ABCDE

| | هەڵسەنگاندن | بەڕێوەبردنی دەستبەجێ |
|---|---|---|
| AIRWAY  | ئایا نەخۆش دەتوانێت بە ئاسایی قسە بکات؟<br>ئەگەر توانای قسەکردنی هەبوو ئەوا ڕێڕەوی هەناسەدان کراوەیە.<br>ئەگەر نەخۆشەکە نەتوانێت قسە بکات سەیری ئەوە بکە کە دیواری قەفەزەی سنگی دەجوڵێت یان نا ؟ وە گوێ لە هەناسەدانی بگرە هەروەها هەست بە جوڵەی دەم و لوتی بکە.<br>گوێ بگرە بۆ هەر دەنگێکی نائاسایی لە هەناسەدان لەوانە (Stridor, grunting, snoring)<br>یگوێ بگرە بۆ دەنگێکی گڕ و بەرز لە هەناسەدانیدا کە ئاماژەیە بۆ گیرانی ڕێڕەوی هەوا.<br>پشکنین بکە بۆ دەنگی یان Hives , Stridorهەبوو لەگەڵ ئاوساوی لەوانەیە نیشانەبێت بۆ هەستیاری توند(Anaphylaxis shock).<br>پشکنین بکە بۆ بونی شلە یان خوێن لە ڕێڕەوی هەناسەی نەخۆش، یانیش بونی هەر تەنێک لە ڕێڕەوی هەناسەی کەسەکەدا ، تێبینی بونی هەر ئاوساویەک بکە لە دەوروبەری ڕێڕەوی هەناسە،گۆڕان لە باریی دەرونیدا .<br>تێبینی بکە ئایە نەخۆشکە دەتوانێت لیکی ناو دەمی قوت بداتەوە یاخود نا. | ئەگەر نەخۆش بێ هۆشبوو بە شێوەیەکی ئاسایی نەیدەتوانی هەناسە بدات ئەوا:<br>ئەگەر زەبری بەر نەکەوتبوو ڕێڕەوی هەناسەدانی بکەرەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکی (Head -tilt-chin-lift maneuver)<br>ئەگەر زەبری بەرکەوتبوو پێویستە بڕبڕەکانی ملی نەجوڵێندرێت وە ڕێڕەوی هەناسەدانی بکەیتەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکی (Jaw-thrust maneuver)<br>دانانی (Oropharyngeal or nasopharyngeal airway) بۆ کردنەوەی ڕێڕەوی هەناسە پێویستە.<br>ئەگەر شتێک هەستی پێکرا لە ناو دەمی کەسەکە بە چاو بینرا ئەوا بە وریایی پێویستە دەری بهێنیت وە نابێت بە هیچ شێوەیک پاڵی پێوە بنێی بۆ ناوەوە.<br>ئەگەر نەخۆشەکە توانای کۆکەی هەبوو یان دەنگی هەبوو هێوری بکەرەوە وای لێبکە بکۆکێت.<br>ئەگەر نەخۆشەکە نەیتوانی بکۆکێت یان دەنگی نەبوو(واتە لە حاڵەتی خنکان بوو) بە گوێرەی تەمەن (Chest -thrust /abdominal thrust/back blow) ئەنجام بدە، ئەگەر نەخۆشەکە لەو ماوەیەدا هۆشی نەما ڕاستەوپێویستە دەست بکەیت بە ئەنجامدانی CPR<br>ئەگەر نەخۆشەکە ئاوساوی زۆربوو لە دەوروبەری وە نیشانەکانی هەستاریی توندی هەبوو ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی ماسولکە ئەدرینالینی پێ بدە.<br>ئەگەر ڕشانەوە یان دەردراو هەبوو سەکشنی پێویستە بۆ ئەنجام بدە ئەگەر لەبەردەست بوو یاخود پاکی کەرەوە ، و ئەگەر نەخۆش زەبری بەر نەکەوتبوو وە بەشەکانی تری نۆرماڵ بوو ڕاستەوخۆ بیخەرە سەر باری (Recovery position)وە لە باری گونجاو بهێڵەوە ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتوو |

| | هەڵسەنگاندن | بەڕێوەبردنی دەستبەجێ |
|---|---|---|
| BREATHING<br> | سەیرکردن، گوێ گرتن و هەست کردن بە ئەوەی ئایا نەخۆشەکە هەناسە دەدات یاخود نا؟ پشکنین بۆ هەناسەدانی نەخۆشەکە بکە و بزانە هەناسەی چۆنە؟ زۆر خێرایە؟ زۆر هێواشە؟ بۆ ئەو نیشانانە بگەڕێ کە دەری دەخات کەسەکە هەناسەدانی نائاساییە لەوانە (Accessory muscle use, chest indrawing,retraction,nasal flaring, abnormal chest movement) وە گوێ لە دەنگی هەناسەی بگرە بۆ هەر دەنگێکی نامۆ بگەڕێ لەوانە (Wheezing or crackles) ئەگەر خیزە(Wheezing)ی سەر سنگی زۆربێت لەوانەیە بە کەمی گوێت لە دەنگی هەناسەی بێت یاخود گوێت لێ نەبێ لەکاتی پشکنین ئەمەش دەکرێت بەهۆی تەسک بونەوەی بۆریەکانی هەوا روویدات.<br>گوێ لە دەنگی هەناسەی نەخۆشەکە بگرە لە هەردوو لای سنگی پشکنین بکە بۆ نەمانی دەنگ لە لایەکی سیەکان یاخود بوونی (Dull) لە ماوەی پێرکەشندا ئەگەر نەخۆشەکە دەنگی هەناسەی نەمابوو لە لایەکی سیەکان وە هەروەها پەستانی خوێنی دابەزیبوو ئەوا پشکنین بکە بۆ (Distended neck vein or a shifted trachea)<br>ئۆکسجین و لێدانی دڵی نەخۆش پێوانە بکە ئەگەر ئامێرەکان بەردەست بوو. | ئەگەر نەخۆشەکە بێ هۆشبوو هەروەها هەناسەدانی ئاسایی نەبوو ئەوا پێویستە دەست بکەیت بە (Bag-valve mask ventilation) وە بە دوایدا (CPR )<br>ئەگەر هەناسەدانی بە شێوەیەکی گونجاو نەبوو (زۆر خاو بوو یان زۆر قوڵ بوو بە گوێرەی تەمەنی نەخۆشەکە) دەست بکە بە(Bag-valve -mask ventilation) ئەگەر ئۆکسجین بەردەست نەبوو نابێ ڤێنتیلەیشن بە هیچ شێوەیەک دوابخرێت بەڵکو پێویستە دەست پێ بکەیت تاوەکو ئۆکسجین ئامادە دەبێت.ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی نەخۆشەکە بکە<br>ئەگەر هەناسەدانی زۆر خێرابوو یاخود ئۆکسجینی کەم بوو پێویستە ئۆکسجینی پێ بدرێت.<br>ئەگەر خیزەی سەر سنگی هەبوو بە گوێرەی حاڵەتەکەی سالبوتامۆڵی پێویستە پێ بدەیت وە دووبارەی بکەیتەوە ئەگەر پێویست بوو. ئەگەر گومانت کرد لەوەی هەستیاری توند (ئەنەفیلاکسیس) بوو پێویستە لە ڕێگەی ماسولکە ئەدرینالینی پێ بدەیت.<br>ئەگەر گومان هەبوو کە تێنشن نیومۆثۆراکس بوو ڕاستەوخۆ پێویستی بە(Needle decompression)<br>دواتر ڕاستەوخۆ ئۆکسجین و فلودی پێ بدرێت، ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی نەخۆش بکرێت، بیرت بێت لە هەردوو حاڵەتی پلوراڵ ئیفیوژن یاخود هیمۆثۆراکس پێویستە ئۆکسجینی پێ بدرێت وە ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی نەخۆشەکە بکرێت.<br><br>ئەگەر هۆکارەکەی نەزانراو بوو پێویستە ئەگەری بەرکەوتنی زەبر لەبەرچاوبگرێت. |

| | هەڵسەنگاندن | بەڕێوەبردنی دەستبەجێ |
|---|---|---|
| CIRCULATION<br> | بگەڕێ بە دوای نیشانەکانی کەمیی ڕۆشتنی خوێن بۆ جەستە لەوانە (ساردو شێداریی پەلەکان، کاپیلەری ڕیفیل زیاتر بێ لە سێ چرکە، دابەزینی پەستانی خوێن ، زیادبوونی هەناسەدان، نەمانی پەڵس<br>بۆ نیشانەکانی هەردوو خوێن بەربونی دەرەکی و ناوەکی بگەڕێ لە بەشەکانی (سنگ ، سک ، گەدەو ڕیخۆڵە لە شکانی حەوز یاخود قاچ، بڕینی ڕاستەوخۆ<br>تێبینی دابەزینی پەستانیی خوێنی نەخۆشەکە بکە ، هەروەها بگەڕێ بۆ (distended neck veins and muffled heart sounds that might indicate (pericardial tamponade | بۆ حاڵەتی (cardiopulmonary arrest) دەست بکە بە ئەنجامدانی CPR بە گوێرەی تەمەن.ئەگەر نیشانەکانی کەمی پێرفوژن هەبوو شلەی IV و ئۆکسجینی پێ بدە(بڕوانە کارامەییەکان)<br>ئەگەر خوێن بەربونەکە دەرەکیی بوو پەستانی ڕاستەوخۆ( Direct pressure) یان ڕێگەکانی تر بەکاربهێنە بۆ کۆنترۆڵکردنی خوێن بەربونەکە(بڕوانە کارامەییەکان)<br>ئەگەر هۆکارەکە نەزانراو بوو ئەگەری ئەوە دابنێ زەبری بەرکەوتبێ بڕوانە بەشی TRAUMA |

| | هەڵسەنگاندن | بەڕێوەبردنی دەستبەجێ |
|---|---|---|
| EXPOSURE<br> | هەڵسەنگاندن بکە بۆ باری هۆش و ئاگایی نەخۆشەکە لە ڕێگەی:<br>AVPU<br>(alert voice,pain,unresponsive)<br>لەو ناخۆشانەشی کە زەبریان بەرکەوتوە پێویستە ڕێژەیی هۆشیاریان پێوانەبکەیت لە ڕێگەی:<br>(Glasco coma scale)<br>هەمیشە ڕێژەی شەکرەی نەخۆش بپێوە ئەگەر هاتوو شڵەژاوبوو یاخود هۆش نەبوو<br>لە هەر چوار پەلدا پشکنین بۆ جوڵەو هەستەوەرەکان بکە.<br>تێبینی هەر جوڵەیەکەی نائاسایی یان دووبارەبوو یاخود لەرزین بکە لە هەریەک لە پەلەکان یان هەردوو لای جەستە.<br>پشکنین بکە بۆ بیلبیلەی چاوی نەخۆش ئایە وەک یەکن؟ یان کاردانەوەیان بۆ ڕوناکی هەیە؟ | ئەگەر باری دەروونی گۆرانی بەسەردا هاتبوو هیچ نیشانەیەکی ترۆما (زەبر) نەبوو نەخۆشەکە بخە سەر باری چاکبونەوە( Recovery position).<br>ئەگەر گلوکۆز ڕێژەکەی دابەزیبوو ، یاخود هیچ ئامێرێک بەردەست نەبوو بۆ پشکنین وە باری ئاگایی نەخۆشەکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو گلوکۆزی پێبدە.(بڕوانە لێهاتوویەکان)<br>(Active sizure) پێویستە (benzodiazepine) پێ بدرێت<br>ئەگەر کەسەکە دووگیان بوو وە گەشکەی لێهاتبوو پێویستە magnisium sulphate پێ بدرێت(بڕوانە دەرمانەکان)<br>ئەگەر بیلبیلەی چاوی نەخۆشەکە بچوک ببوو وە هەناسەدانیشی کەمتر بوو لە ڕێژەی ئاسایی ئەگەری هەیە ڕێژەیەکی زۆر لە دەرمانە ئۆپیۆیدەکان بەکارهاتبێت پێویستە ن(naloxone)ی پێ بدرێت.<br>ئەگەر بیلبیلەی چاوی وەک یەک نەبوو ئەگەری هەیە پەستانیی سەر مێشک زیادی کردبێت ، بۆیە پێویستە سەری نەخۆشەکە بە گۆشەی ٣٠ پلە بەرزر بکرێتەوە لە حاڵەتێک ئەگەری ئەوە نەبوو زەبر بەر بڕبڕەی پشت یان ملی کەوتبێ.<br>ڕاستەوخۆ پێویستە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی پەلەی بۆ بکرێت.<br>ئەگەر هۆکارەکە نەزانراو بوو ئەگەری ئەوە دابنێ لەوانەیە زەبری بەر کەوتبێ پێویستە بڕبڕەکانی لە جوڵە پارێزراو بێت. |

| | هەڵسەنگاندن | بەڕێوەبردنی دەستبەجێ |
|---|---|---|
| DISABLITY  | **هەموو جەستەی نەخۆشەکە بپشکنە بە تەواوەتی (برین-ڕوشاوی ،گەستن....هتد) هەندێک جۆری(Rash such as Hives) هەن دەکرێت ئاماژەبن بۆ هەستیاریی توند یانیش هەوکردنی توند لە ناوەوەی جەستە** | **ئەگەر پێوەدان و گەستنی مار بوو نابێ پەلەکە بجوڵێندرێت ، ئەگەر گونجا وە ماوەیەکی دووری لە نێوانتام هەبوو وێنەیەکی مارەکە بگرە و لەگەڵ نەخۆشەکە بینێرە ، هەوڵی کوشتن یان گرتنی مارەکە مەدە هەموو جۆرە خشڵ و جلوبەرگێک لەو شوێنە لابەرنەخۆشەکە داپۆشە بۆ ڕێگری کردن لە دابەزینی پلەی گەرمی لەشی.ئەگەر جل و بەرگی نەخۆش تەڕ بوو لایبەرەو لەشی نەخۆشەکە وشک بکەرەوە لە ماوەی بەرکەوتنت لەگەڵ نەخۆش ڕێز لە نەخۆش بگرەئەگەر هۆکارەکە نەزانراو بوو ئەوا ئەگەری ئەوە لەبەرچاوبگرە لەوانەیە زەبری بەرکەوتبێ نابێ بڕبڕەکانی جوڵە بکەن بۆیە لە کاتی گواستنەوەی پێویستە ئەم تەکنیکە بەکار بهێنرێت** (Log roll maneuver) |

## (حاڵەتە توند و مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان)

**ئەم بەشە چاوێکی قووڵتر دەخاتە سەر ئەو بارودۆخانە کە دەبێت لە ڕێبازیABCDE دا بەڕێوەببرێن.**

# Airway conditions



| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Obstruction due to foreign Body | نیشانەکانی بریتین لە (دەردراو یاخود ڕشانەوە،بینینی شت لە ناو دەمی نەخۆش، دەنگی نائاسایی لەوانەStridor,snoring,gurglin گۆڕانی باریی هۆش و ئاگایی نەخۆشەکە ،کەمبونەوەی فراوانبونی قەفەزی سنگ لە ماوەی هەناسەدان. | ڕێڕەوی هەوا لەوانەیە گیران تیایدا ڕوودات بە هۆی تەنێکەوە یاخود بەهۆی ڕشانەوەو دەردراوەوە بە وریای هەوڵ بدە تەنەکە لە دەمی نەخۆشەکە دەربهێنە ئەگەر گونجا ،بەڵام بە هیچ شێوەیەک هەوڵ مەدە پاڵ بە تەنەکەوە بنێی بۆ قوڕگی نەخۆشەکە ،وە هەروەها هەوڵ مەدە ئەو شتەی لە دەمی نەخۆشەکەیە بیهێنیتە دەرەوە هەتا بە تەواوی دیار نەبوو.<br>ئەگەر ڕێڕەوی هەناسە بە تەواوی گیرابوو بە گوێرەی تەمەن دەست بکە بە پرۆتۆکۆڵەکان:<br>(Chest thrust/Abdominal thrust/Back blow)<br>لەوانەیە زمان ببێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەناسە ئەگەر هاتوو باریی ئاگایی نەخۆشەکە گۆڕانکاری بەسەردا هات.<br>ئەگەر نەخۆشەکە زەبری بەرکەتبوو بوو ڕێڕەوی هەناسەی بکەرەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکی:<br>(Jaw thrust maneuver)<br>ئەگەر هاتوو زەبرە بەرنەکەوتبوو ڕێڕەوی هەناسە بکەرەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکی:<br>(Head-tilt and chin-lift maneuver)<br>ئەگەر پێویستی بە تیوب بوو<br>(Oral or nasopharyngeal airway)بەکاربهێنە بە گوێرەی بارودۆخەکە(چونکە لە هەندێک بارودۆخ ناتوانرێ لەم ڕێگایانەوە بەکاربهێنرێت)<br>ئەم نەخۆشانە بە گشتی توانای پاراستن و کۆنترۆڵکردنی بۆری هەوایان نیە بۆیە پێویستە چاودێری دەردراوی ناو دەم یاخود ڕشانەوەی بکەیت<br>ئەگەر گیرانەکە نەتوانرا چارەسەر بکرێت ڕاستەوخۆو بە پەلە پێویستە بگوازرێتەوە بۆ نەخۆشخانە. |

| باردۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Obstruction due to burns | نیشانەکانی بریتین لە (سوتانی ناوچەی سەر و مل ،سوتانی مووەکانی ناو لوت ،یان (Soot) لە دەوروبەری لوت و دەم،<br>دەنگی نائاسایی لەوانە<br>(Stridor)،گۆڕان لە دەنگی نەخۆش،<br>کەمی کشانی قەفەزەی سنگ لە ماوەی هەناسەدان. | سوتان لەوانەیە ببێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەناسە ئەگەر زیانەکە بە هۆی هەڵمژینی ماددەیەکی ژەهراوی بۆ سییەکان بێت.<br>پێویستە ئۆکسجین بە هەمووئەو نەخۆشانە بدەیت کە سوتاون تەنانەت ئەگەرهیچ نیشانەیەکی کەمی ئۆکسجینیشی نەبوو.<br>ڕێڕەوی هەناسە بە کراوەی بهێڵەوە لە ڕێگەی مانیوڤەری گونجاوەوە .وە ئەگەر پێویستی کرد تیوبی گونجاوی بۆ دابنێ<br>ئەگەر گومان هەبوو زەبری بەرکەوتبێ بڕبڕەکانی مەجوڵێنەو بو جێگیریی بهێڵەوە.<br>لە حاڵەتی سوتاندا دەکرێت زۆر بە خێرای ڕێڕەوی هەوا توشی گیران و ئاوساوی ببێت بۆیە پێویستە ڕاستەوخۆ و بە پەلە کار بۆ گواستنەوەی نەخۆش بکرێت بۆ نزیکترین نەخۆشخانە. |

| باردۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Obstruction due to severe Allergic reaction anaphylaxis | ئاوساوی لێو ، دەم، زمان<br>کێشە لە هەناسەدان هەروەها دەنگی نامۆی هەیە.<br>پەڵەی جیاواز لەسەر پێست دروست دەبێت لەوانەیە پێستی کەسەکە سور ببێتەوە یان سپی هەڵگەڕابێت وە خوران دروست ببێ<br>خێرای لێدانی دڵ و دابەزینی پەستانی خوێن<br>دەنگی جیاواز و نائاسایی دروست دەبێ لەوانە<br>(Stridor, snoring,gurgling)<br>کەمبونەوەی کشانی قەفەزی سنگ لە ماوەی هەناسەدان | هەستیاریی توند دەکرێت ببێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەوا<br>ئەگەر ڕێڕەوی هەوا گیرابوو کەسەکە توانای هەناسەدانی نەبوو هەروەها خیزەی سەر سنگی هەبوو وە شۆک بوو حاڵەتەکەی پێویستە دەرزی ئەدرینالینی بۆ بکرێت لە ڕێگەی ماسولکەوە بەڵام دەکرێت هەستیاریەکە دووبارەببێتەوە ئەوکاتەی ئەدرینالینەکە کاریگەری نامێنیت بۆیە پێویستە بە وردی چاودێری نەخۆش بکەیت بۆ دووبارە بونەوەی حاڵەتەکەی وە پێویستی کرد ژەمی دووەمی ئەدرینالیژی بۆ بکرێت.<br>فلودی لە ڕێگەی ئای ڤیەوە پێدەدەین.<br>دووبارە پۆزیشنی نەخۆشەکە چاک بکە ئەگەر پێویست بوو وە ئۆکسجینی پێ بدە.<br>ئەگەر خراپتر بوو یاخود حاڵەتەکە هیچ بەرەو پێش نەچوو ڕاستەوخۆو بە پەلە کار بۆ گواستنەوەی نەخۆش بکە بۆ نەخۆشخانە. |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Obstruction due to trauma | ئەگەر هیمەتۆما(کۆبونەوەی خوێن لە ژێر پێست) لە ملیدا هەبوو ، یاخود زەبرەکە بەر ناوچەی مل یان سەر کەوتبوو.<br>دەنگی نامۆو نائاساییی وەک (Stridor,snoring,gurgling)<br>گۆڕان لە دەنگی نەخۆش هەبوو.<br>کەمبونەوەی کشانی قەفەزەی سنگ لە ماوەی هەناسە وەرگرتن. | گیرانی ڕێڕەوی هەوا هەندێک جار لەوانەیە لە ئەنجامی بەرکەوتنی زەبەرەوبێت لە ناوچەی مل و سەر.<br>خوێن ئێسک یانیش شانەی تێکشکاو لەوانەیە ببنە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەوا بڕینی کراوە لە ملدا دووبارە ئەگەری هەیە ببێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەوا.<br>سەکشنی بۆ بکە ئەگەر پێویست بوو بۆ لابردنی خوێن و شلە<br>ڕێڕەوی هەوا بە کراوەی بهێڵەوە لە ڕێگەی تەکنیکی (Jaw-thrust maneuver).<br>ئەگەر پێویست بوو تیوب دابنێ بۆ نەخۆشەکە بەڵام لە ڕێگەی لوتەوە تیوب دانانرێ ئەگەر زەبرەکە بەر ڕوخساری نەخۆش کەوتبوو<br>پێویستە بڕبڕەکانی پشت و مل بە نەجوڵاوی بهێڵدرێتەوە.<br>بە پەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی نەخۆش بکە. |

# Breathing condition



| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Tension pneumothorax | دابەزینی پەستانی خوێن ، ناتوانینی هەناسەدان وە هەبوونی کۆمەڵێک نیشانەی دیکە لەوانە: Distended neck vein ,absent ) breath sound on the affected area, hyperresonance with percussion on the affected side ,tracheal shifted away from (affected site | هەموو جۆرەکانی نیوموثۆراکس ئەگەری هەیە ببێتە تێنشن نیومۆثۆراکس . بوونی هەوا لە ناو ئەو دوو پەردەیەی دەوری سیەکان لەوانەیە ببێتە هۆی تێکشکانی سیەکان (simple pneumothorax)، زیادبوونی پەستانیش (tension)دەبێتە هۆی گیرانی ئەو خوێن بەرە سەرەکیەی خوێن بۆ دڵ دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ کە ئەمەش دەبێتە هۆی شۆک. ئەگەر نیشانەکانی نیومۆثۆراکسی تیابوو ڕاستەوخۆ پێویستە ( needle decompression) ئەنجام بدرێت و ئۆکسجینی پێ بدرێت ، هەروەها لە ڕێگەی ئای ڤیەوە فلودی پێویستە پێ بدرێت. ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی نەخۆشەکە بکە. |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Suspected Opiod overdose | هەناسەدانی نەخۆش کەم دەبێتەوە ئۆکسجینی دادەبەزێت بیلبیلەی چاوی زۆر بچوک دەبێتەوە. | دەرمانە ئۆپیۆیدەکان لەوانە (مۆرفین و پێثیدین و هیرۆین )توانای جەستە بۆ هەناسەدان کەم دەکەنەوە. پێدانی نالۆکسۆن(Naloxne) بە وردی چاودێری بکە بۆ پێدانی ژەمەکانە دیکە(بروانە لێهاتوییەکان) ئۆکسجین بە نەخۆش بدە(بروانە لێهاتوییەکان). |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Asthma/COPD chronic obstructive pulmonary disease | خیزەی سنگ ،کۆکە ،بەکارهێنانی ئەکسیسەری مەسڵەکان لە کاتی هەناسەدان، پێشتر نەخۆشەکە نەخۆشی درێژخایەنی سیەکانی هەیە وەک ڕەبۆ. | ڕەبۆو(COPD) دوو حاڵەتن کە دەبنە هۆی ڕەقبوونی بۆڕیچکە هەواییەکانی ڕێڕەوی هەوا لە بەشی خوارەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی تەسکبونەوەی بۆڕێچکەکانی هەوا و زەحمەتی لە هەناسەدان و دروستبوونی(wheezing)لە سییەکاندا هەر بۆیە پێویستە.: سالبوتامۆڵی پێ بدە بە زوترین کات(بروانە لدەرمانەکان) ئەگەر پێویستی کرد ئۆکسجینی پێ بدە(بروانە لێهاتوییەکان) |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Large pleural effusion/haemothorax | کەمبونەوەی هەناسەدان لە شوێنەکە، لە ماوەی پێرکەشندا دەنگی (dull) دروست دەکات،ئەگەر ڕێژەی شلەکە زۆربوو ئەگەری هەیە ببێ بە شۆک. | (Plural effusion)دروست دەبێ لە ئەنجامی کۆبونەوەی شلە لەنێوان سیەکان و قەفەزی سنگ یان ناوپەنچک کاتێ ئەم شلەیە کۆدەبێتەوە وا دەکات کشانی سیەکان کەم بێتەوە لە کاتی هەناسەدان بۆیە پێویستە ئۆکسجینی پێ بدەیت.<br>ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بۆ یەکەیەکی پێشکەتووی چارەسەر. |

# Circulation conditions



| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Pulsslessness | نەمانی پەڵس،بورانەوە،نەمانی هەناسە | Cardiopulmonary resuscitation<br>CPR |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Shock | زیادبوونی لێدانی دڵ ، زیادبوونی هەناسە،سپی هەڵگەڕانی پێست و ساردبوونی، کاپیلەری ڕیفیلێ زیاتر بێ لە سێ سانیە ،ئارەقکردنەوەیەکی زۆر،لەوانەیە نەخۆشەکە وڕ ببێ، باریی هۆش و ئاگایی گۆڕانی بەسەردا بێت،دابەزینی پەستانیی خوێنیش لەگەڵدایە. | بریتیە لە نەتوانینی گواستنەوەی خوێنی پڕ ئۆکسجینی تەواو بۆ جەستە و ئەندامە سەرەکیەکان .کاتێک ئەمە ڕوودەدات و بەردەوام دەبێت وردە وردە کاری ئەندامەکان دەوەستێت و کەسەکە دەمرێت.<br>یەکەمین هەنگاو بریتیە لەوەی نەخۆشە پاڵبکەوێت.<br>ئۆکسجینی پێ بدرێت.<br>ئەو خوێن بەربونەی هەیە کۆنترۆڵ بکرێت.<br>ڕاستەوخۆو بەپەلە ئای ڤی فلودی پێ بدرێت.<br>هەر نیشانەیەکی هەوکردن هەبوو دەرمانی دژە میکرۆبی بۆ بەکاربهێنرێت..<br>ڕاستەوخۆو بە پەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکرێت. |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Severe bleeding (haemorhage) | خوێن بەربون لە برین، سوربونەوە دەوری ناوک، لاتەنیشتەکان دەکرێت نیشانەی خوێن بەربونی ناوکی بن ،خوێن بەربون لە کۆم یانیش زێ یانیش خوێن لە ناو ڕشانەوە، شکانی ئێسکی حەوز ، کەمبونەوەی دەنگی | خوێن بەربونی دەرەکی ئەگەر بە خێرایی نەوەستێنرێت دەکرێ لە ماوەیەکی کەم ببێتە شۆک.<br>هەروەها دەکرێت بڕێکی زۆر خوێن لەناو سنگ و حەوز و ڕان و سکدا لەدەست بچێت پێش ئەوەی خوێنبەربوونەکە بناسرێتەوە.<br>وەستاندنی خوێن بەربونەکە بەندە لەسەر سەرچاوەکە لەوانە:<br>Direct pressure<br>Deep wound packing |

| | | |
|---|---|---|
| | هەناسە لە لایەکی سیەکان (هیمۆثۆراکس)،نیشانەکانی کەمی ڕۆشتنی خوێن بۆ بەشەکانە جەستە وەک (کەمبونەوەی پەستانی خوێن،زیادبوونی لێدانی دڵ،سپی هەڵگەڕانی پێست، ئارەقکردنەوەیەکی زۆر(diaphorisis) | A tourniquet<br>Pelvic binder or femur splint<br>لە ڕێگەی ئایڤیەوە فلودی پێبدە<br>وەرگرتنی خوێن و گواستنەوە ئەگەر پێویستی کرد<br>تۆرنیکا تەنیا لەو حاڵەتانە بەکاردێت کە حاڵی نەخۆشەکە مەترسی لەسەر ژیانی دروست دەکات |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Pericardial temponade | کەمی ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین بۆ جەستە (زیادبوونی لێدانی دڵ و هەناسەدان،دابەزینی پەستانیی خوێن، سپیَ هەڵگەڕانی پێستی نەخۆشەک،کاپیلەری ریفیلێ زیاتر بێت لە سێ سانیە)<br>Distended neck vein,muffled heart sound<br>لەوانەیە نەخۆشەکە هەست بە وڕبون بکات ،بشڵەژێت وە باری هۆش و ئاگایی گۆڕانکاری بەسەردا بێت. | ڕوودەدات لە ئەنجامی کۆبونەوەی شلە لە پەردەی دەوری دڵ کە دەکرێت ببێتە هۆی تێکشکانی ژورەکانی دڵ.وادەکات خوێنی پڕ ئۆکسجین کەمتر بەرەو شانەو ئەندامەکان بڕوات وە ببێتە شۆک بۆیە پێویستە ئەو شلەیەی لە دەوری دڵی کۆبۆتەوە لاببرێت.<br>تاوەکو ئەوکاتەی نەخۆشەکە دەگاتە نەخۆشخانەو دەتوانرێت شلەکەی بۆ لاببرێت پێویستە ئایڤی فلودی پێبدرێت تاوەکو گواستنەوەی خوێن بەردەوام بێت.<br>ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی بۆ ژوری نەشتەرگەری بکرێت. |

# Disability conditions



| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Hypoglycemia | ئارەفکردنەوەی زۆر ،گۆڕانکاریی لە باری هۆش و ئاگایی کەسەکە(لە شلەژانەوە تاوەکو بێ هۆشی)،گەشکە ،دابەزینی ڕێژەی گلوکۆز،نەخۆشەکە مێژووی نەخۆشی شەکرە یاخود مەلاریا یانیش هەوکردنی توندی هەیە،وەڵامدانەوەی زۆر باشە بۆ وەرگرتنی گلوکۆز. | ئەو نەخۆشانەی ڕێژی گلوکۆزیان دابەزیوە پێویستە ڕاستەوخۆ گلوکۆز وەربگرن.<br>ئەگەر نەخۆشەکە توانای قسەی هەبوو یانیش توانای قوتدانی هەبوو لەڕێگەی دەمەوە گلوکۆزی پێبدە(بڕوانە لێهاتوویەکان).<br>ئەگەر نەخۆش توانای قسەی نەبوو یان هۆشی نەبوو لە ڕێگەی دەمارەوە پێی بدە(بڕوانە لێهاتوییەکان).<br>ئەگەر لەو دوو ڕێگەیە نەکرا لە ڕێگەی بوکاڵ پێی دەدرێت(بڕوانە لێهاتوییەکان). |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Increased pressure on the brain | سەرئێشە،گەشکە،هێڵنجدان و ڕشانەوە،گۆڕانکاریی لە باری هۆش و ئاگایی،نایەکسانی لە بیلبیلەی چاو،بێهێزی لە لایەکی جەستە. | زیادبووبی پەستانی سەر مێشک دروست دەبێت لە ئەنجامی بەرکەوتنی زەبری دەرەکی، بوونی گرێ لە مێشک ،زیادبوونی فلود،خوێن بەربون یان هەوکردن،لەبەر ئەوەی کەلللەی سەر ڕەقە بۆیە هەر جۆرە ئاوساویەک ، گرێیەک، شلەیەک دەکرێت ببێتە پەستان لەسەر مێشک کە ئەمەش وادەکات ڕۆشتنی خوێن بۆ مێشک کەم ببێتەوە لە ئەنجامدا ببێتە هۆی مردن.<br>بۆیە پێویستیە بێدی نەخۆشەکە بە پلەی ۳۰ بەرز بێتەوە ئەگەر هیچ زەبرێک نەبوو یانیش نەخۆشەکە پەستانی خوێنی دانەبەزیبوو.<br>ڕێژەی شەکری خوێنی پێوانە بکە.<br>ئەگەر گەشکەی لێهاتبوو (benzodiazepine) پێ بدە.<br>ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بۆ نەخۆشخانە بکە چونکە پێویست دەکات نەشتەرگەری بۆ بکرێت. |

| باروۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Sizure/convulsion | :Signs of active sizure<br>جوڵەی دوبارەبوو،<br>gaze fixed to one side or alternating rhythmically and not responsive<br>نیشانەکانی نەخۆشێک کە بەم نزیکانە گەشکەی لێهاتبێت:<br>Bitten tongue<br>میز ڕانەگرتن<br>مێژووی هەبوونە گەشکە و لێهاتنی بەم دووابیە<br>شڵەژان کە وردە وردە بەرەو باشتربوون دەچێت لەماوەی چەن دەقەیەک یان سەعاتێک | چارەسەر:ئامانج لە چارەسەرکردن و بەڕێوەبردنی حاڵەتەکانی گەشکە ئەوەیە نەخۆشەکە بپارێزی لەوەی زیانی بەرکەوێت ، هەروەها پلەی گەرمی جەستەی دابەزێت.<br>لە شوێنی بەرز بیپارێزە وە هەر کەرەستەیەکی تیژ نزیکی بوو دوریخەرەوە.<br>هیچ شتێک لە ناو دەمی نەخۆش دامەنێ ئەگەر ئەکتیڤ سیژەری هەبوو جگە لەوەی بتەوێت سەکشنی بۆ بکەیت.<br>ئۆکسجینی پێ بدە.<br>ئەگەر ڕێژەی گلوکۆز دابەزیبوو گلوکۆزی پێبدە.<br>ئەگەر هاتو benzodiazepine ت پێدا چاودێری وردی نەخۆشەکە بکە بۆ خاوبونەوەی تواناى هەناسەدان یان وەستانی.<br>نەخۆش بخە سەرباری (recovery position) ئەگەر هاتو هیچ زەبرێکی بەرنەکەوتبوو.<br>ئەگەر ئافرەتی دوگیان بوو یانیش بەم دواییانە منداڵی ببو پیویستە (magnesium sulphate)پێ بدرێت. |

# Exposure Conditions



| باروۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Snake bite | ئەگەر کاتی پێوەدانەکە مارەکە بینرابوو،<br>شوێن دانی مارەکە لەسەر جەستەی کەسەکە کەوتبوو، ئاوساوی هەبوو ، بڵقی ئاوی هەبوو لەسەر پێستەکە،سوربونەوە،دابەزینی پەستانیی خوێن،ئیفلیجبوون،گەشکە،بڕینەکە خوێنی هەبوو. | ئامانج لە بەڕێوەبردنی پێوەدانی مار ئەوەیە کە زیانی کەمتر بێ بۆ نەخۆشەکە وە ڕێگری لە زۆر بڵاوبوبەوەی ژەهرەکەی بکرێت لە جەستەدا.<br>نابێ پەلەکان زۆر جوڵەی پێ بکرێت.<br>ئەگەر توانراو دووریەکی دیاریکراو لە نێوان خۆت و مارەکە هەبوو وێنەیەکی بگرە و لەگەڵ نەخۆشەکەی بنێرە.<br>ئەگەر هەر نیشانەیەکی شۆک هەبوو پێویستە ئای ڤی پێ بدە.<br>هەندێک نەخۆش هەیە لەوانەیە نیشانەکانی شۆکی بە درەنگی تێدا دەربکەوێت بۆیە پێویستە بە وردی چاودێری بکەیت. |

# ڕەچاوکردنیABCDE ی منداڵان

**لە کاتێکدا کە ڕێبازی** ABCDE **لە هەردوو گەورەساڵان و منداڵاندا بەکاردەهێنرێت، هەندێک لایەنی هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردنی منداڵان هەن کە جیاوازن لە گەورەکان. بەشەکانی "ڕەچاوکردنی پزیشکی منداڵان" لە سەرانسەری کتێبەکەدا تیشک دەخەنە سەر ئەم جیاوازییانە.**

<table>
<tr><th colspan="2">Paediatric considerations</th></tr>
<tr><td colspan="2">Pediatric airway conditions</td></tr>
<tr><td colspan="2">ژانی زۆر،stridor، ئاوسانی بۆری هەوا و ئامادەنەبوون بۆ جوڵاندنی مل هەموویان نیشانەی مەترسین لە منداڵاندا. لە بۆری هەناسەدا بە وردی سەیر بکە بۆ بوونی تەنی نامۆ، سووتاوی یان گیران. ڕێگە بدە منداڵەکە لە دۆخێکی ئاسوودەییدا بمێنێتەوە.</td></tr>
<tr><td>بەبەراورد بە کەسانی پێگەشتوو.</td><td>پێویستە چی بکەین؟</td></tr>
<tr><td>بەبەراورد بە کەسانی پێگەشتوو منداڵان زمانیان گەورەترە.</td><td>منداڵەکە دەخەینە سەر سنیفین پۆزیشن.</td></tr>
<tr><td>ملیان کورترە بۆیە ئەگەری گیرانی بۆڕی هەوا زیاترە.</td><td>زۆر پەستان لەسەر مل و سەری دروست مەکە</td></tr>
<tr><td>سەریان گەورەترە بە بەراورد بە بەشەکانی دیکەی جەستەیان.</td><td>بە وریای چاودێری ڕێڕەوی هەوای بکە.<br>ئەگەر ڕێڕەوی هەناسەی داخرابوو<br>بەکاربهێنە(jaw thrust maneuver)<br>Position head (using padding under shoulders for very small children) to open airway if no trauma</td></tr>
</table>

## Pediatric breathing conditions



### Nasal flaring, head bobbing, grunting and chest indrawing OR retractions

ئەمانەی سەرەوە نیشانەکانی دیسترێسن لە منداڵاندا

(Cyanosis)

گۆڕان بۆ ڕەنگی شین لە دەوری لێو،دەم،سەری پەنجەکان کە ئەمەش لە ئەنجامی کەم ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجینەوە دروست دەبێت ، هەروەها یەکێکە لە نیشانە مەترسیدارەکان.

Chest indrawing

بەکارهێنانی ئەکسیسەری مەسڵەکانە کاتی هەناسەدان وە یەکێکە لە باوترین نیشانەکان لە منداڵاندا.

سەیری بەشەکانی خوارەوەی سنگی بکە کاتی هەناسەدان (پەراسووەکانی بەشی خوارەوە)، منداڵەکە لە کاتی هەناسەدان بەشی خوارەقەی سنگی دەچێتە ناوەوە.

لە منداڵێک کە بەشێوەیەکی ئاسایی هەناسەدەدات هەردوو بەشی سەرەوەو خوارەوەە سنگی دەچێتە دەرەوە کاتێک هەناسە وەردەگرێت

A silent chest

کاتێک گوێ لە سنگی منداڵەکە دەگریت هیچ دەنگێکی هەناسەدان نیە ،کە ئەمە نیشانەیەکی زۆر دیاری دیسترێسە لە منداڵاندا.لە کاتی تەسکبونەوەی زۆر یانیش ڕەقبونی بۆرێچکەکانی هەوادا هەم ڕێژەیەکی کەم هەوا دەچێتە سیەکان هەم بە شێوەیەکی کەم گوێت لە دەنگی هەناسەدانی منداڵەکە دەبێت لە کاتی(Physical Examination)دا.

پێویستە بە گوێرەی حاڵەتەکە سالبوتامۆڵ و ئۆکسجینی بدرێتێ وە بەردەوام پشکنینی بۆ بکرێت بۆ چاودێری کردنی ئەوەی ئایا حاڵەتەکەی بەرەو باشتر چوە یانیش خراپتر بوە.

Stridor

ئاماژە بە تێکچوونی ڕێڕەوی هەناسەدان دەکات و هۆکاری زۆرە.ئەو منداڵانەی (Stridor)یان هەیە  دەبێت لە شوێنێکی ئارام بمێنێتەوە و ڕاستەوخۆ بگوازرێتەوە بۆ

دابینکەرێکی پێشکەوتوو. چارەسەریش ئەنجامدانی هەڵمە بە ئەدریناڵین

ئەگەر ڕاستەوخۆ نەتوانرا گواستنەوەی بۆ بکرێت لە ڕێگەی ماسولکەوە ئەدریناڵینی پێ دەدرێت  بە گوێرەی حاڵەتەکەی.



Chest indrawing

## Pediatric circulation conditions



بەڕێوەبردنی کەم ڕۆشتنی خوێنی کەم ئۆکسجین(poor perfussion) لە منداڵاندا ڕەنگە بگۆڕێت بە پشتبەستن بە هۆکارەکە و بە پێی بارودۆخی منداڵەکە.

دابەزینی پەستانی خوێن لە منداڵدا نیشانەی شۆکێکی توندە. منداڵان توانای پاراستنی پەستانی خوێنی ئاساییان هەیە بۆ ماوەیەکی زیاتر لە گەورەکان کاتێک تووشی شۆک دەبن. لە نزیکەوە چاودێری نیشانەکانی تری خراپی بکەن پەرفیوژن، وەک کەمبوونەوەی دەرچوونی میز و گۆڕینی باری دەروونی.

بڕی (intravenous fluid)کە دەدرێت بە منداڵان جیاوازە لە گەورەکان. لە منداڵانی بەدخۆراکیدا، هەردوو ڕێژەی بەڕێوەبردنی شلە و جۆری شلە جیاوازن. نیشانە توندەکان بریتین لە

: Sunken fontanelle, poor skin pinch ,lethargy, altered mental status

## Pediatric Disability conditions



دابەزینی گلوکۆزی خوێن هۆکارێکی زۆر باوی گۆڕانی باری دەروونییە لە منداڵانی نەخۆشدا.

ئەگەر دەکرێت، پشکنینی گلوکۆزی خوێن لەو منداڵانەی کە باری دەروونییان گۆڕاوە پێویستە .

کاتێک نەتونرا ئاستی گلوکۆزی خوێن بپشکنرێت، گلوکۆزی پێ بدە.

هەمیشە پشکنین بکە بۆ بوونی گەشکە.

هەندێک جار ئەستەمە بزانین کە ئایا منداڵەکە بە شێوەیەکی ئاسایی ڕەفتار دەکات یان نا. هەمیشە پرسیار لەو کەسە بکە کە بەخێوکەری منداڵەکەیە.

## Pediatric Exposure conditions



که کۆرپە و منداڵان کێشەیان هەیە لە پاراستنی پلەی گەرمی و زۆر بە خێرایی دەتوانن تووشی کەمی پلەی گەرمیی (hypothermia) یان بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی (hypersthermia)

جل و بەرگی تەڕ و وشککردنەوەی پێست بە باشی پێویستە. کاتێک کە دەتوانرێت کۆرپە (infant)پێست بە پێست لەگەڵ دایکیی دابنێ ئەگەر گونجا.

ئەگەر پلەی گەرمی دابەزیبوو، دڵنیابە کە سەری کۆرپە دادەپۆشیت(جگە لە دەموچاو یان روخسار).

ئەگەر پلەی گەرمی بەرز ببۆوە ئەگەر کۆرپەی بە توندی پێچرا بۆوە ببکەرەوە.

# Pediatric dangerous signs

جگە لە ئەنجامدانی ڕێبازێکی وردیABCDE ، پێویستە هەموو نەخۆشانی منداڵ هەڵسەنگاندنیان بۆ بکرێت بۆ بوونی نیشانەکانی مەترسی . ئەو منداڵانەی کە نیشانەکانی مەترسییان هەیە پێویستیان ڕەوانەکردن و ڕادەستکردنی بەپەلەهەیە بۆ دابینکەرێک یاخود نەخۆشخانەیەک کە بتوانێت چاودێری پێشکەوتووی منداڵان پێشکەش بکات.

نیشانەکانی مەترسی منداڵان بریتین لە:

- نیشانەکانی گیرانی بۆری هەوا (ستریدۆر یان منداڵەکە ناتوانێت لیکی قووت بدات)
- زیادبوونی هەوڵی هەناسەدان (هەناسەدانی خێرا، فلارینگ، خرۆشان، نەکشانی قەفەزی سنگ بە تەواوی لە کاتی هەناسەدا)
- cyanosisڕەنگی شینی پێست بەتایبەت لە لێو و سەری پەنجە
- گۆڕانی باری دەروونی (لەوانەش بێهێزی یان خەواڵوویی نائاسایی، سەرلێشێواوی)
- تەنها کاتێک دەجووڵێت کە هاندرابێت یان هیچ جووڵەیەک نییە
- توانای خواردنی نیە یاخود شیری دایکی بە تەواوی ناخوات
- ڕشانەوەی هەموو شتێک
- گرژبوونی ماسولکەکانی یان sizure
- دابەزینی پلەی گەرمی لەش

# Elements of the SAMPLE history

**ڕێگەیەکی ستانداردە بۆ کۆکردنەوەی مێژووی سەرەکی پەیوەست بە برینداربوونی نەخۆش . سەرچاوەی زانیارییەکان بریتین لە: کەسی نەخۆش/بریندار، ئەندامانی خێزان، هاوڕێیان، تەماشاکەران، یان دابینکەرانی پێشوو.**

SAMPLEکورتکراوەی

- ✓ S:sign and symptoms **نیشانەکان**

  **ڕاپۆرتی نەخۆش/خێزان سەبارەت بە نیشانەکان گرنگە بۆ هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردن**

- ✓ A:allergy**هەستیاری**

  **گرنگە ئاگاداری هەستیاریی دەرمان بیت بۆ ئەوەی چارەسەرەکان زیان بە کەسەکە نەگەیەنن چونکە ڕەنگە بوونی هەستیاریی توند ببێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە**

- ✓ M:medication**دەرمانەکان**

  **لیستی تەواوی ئەو دەرمانانە وەربگرە کە کەسەکە لە ئێستادا دەیخوات و پرسیار بکە دەربارەی دەرمانەکانی ئەم دواییە یان گۆڕینی ژەمە دەرمانەکە. ئەمانە ڕەنگە کاریگەرییان هەبێت لەسەر بڕیارەکانی چارەسەرکردن و گرنگن بۆ تێگەیشتن حاڵەتە درێژخایەنەکانی کەسەکە.**

- ✓ P:past medical history**مێژووی پزیشکی ڕابردوو**

  **زانینی بارودۆخی پزیشکی پێشووی نەخۆش لەوانەیە یارمەتیدەر بێت بۆ تێگەیشتن لە نەخۆشییەکەی ئێستا و لەوانەیە هەڵبژاردنەکانی بەڕێوەبردن و چارەسەرکردن بگۆڕێت.**

- ✓ L:last oral intake**دوا خواردنی زارەکی**

  **کاتی دوایین خواردنی زارەکی تۆمار بکە و ئایا ڕەق یان شلە بووە چونکە گەدەی پڕ زۆربەی جار مەترسیە بۆسەر ڕشانەوە و دواتر خنکان زیاد دەکات، بە تایبەت (sedation یان intubation)کە ڕەنگە پێویست بێت بۆ ڕێکارەکانی نەشتەرگەری.**

- ✓ E:event**ڕووداوەکانی دەوروبەری برینداربوون یان نەخۆشییەکە**

  **زانینی بارودۆخی دەوروبەری برینەکە یان نەخۆشییەکە ڕەنگە یارمەتیدەر بێت بۆ تێگەیشتن لە هۆکار**

# DISPOSITION CONSIDERATIONS

**ئەگەر پێویست بوو دەستێوەردان بکەین لە هەر یەک لە قۆناغەکاندا دواتر دەسبەجێ پلان دابنێ بۆ ڕادەستکردن /گواستنەوەی بۆ ئاستێکی بەرزی چاودێری.**

**کاتێک کە ڕێبازەکەت تەواو کرد ، سامپڵ هیستریەکی نمونەیی وەربگرە پشکنینی جەستەیی** ( Physical Examination ) **تەواو بکە**

**پوختەیەکی باش و تەواو بۆ دابینکەران و تیمی تەندروستی پێویستی بە ئەم چەند خاڵە هەیە:**

- ✓ **باسکردن و ناسینەوەیەکی کورتی نەخۆشکە و حاڵەتەکەی**
- ✓ **پشکنینی جەستەیی**(Physical examination)**.**
- ✓ **هەموو ئەو کارانەە بۆ نەخۆشەکەت کردوە تۆماری بکە.**
- ✓ **پلان بۆ کاری دواتر دابنێ یان هەر جۆرە نیگەرانیەکت هەیە بینوس**

FOR REFERENCE: NORMAL VITAL SIGNS

NORMAL ADULT VITAL SIGNS

- ƒ ƒ Pulse rate: 60–100 beats per minute
- ƒ ƒ Respiratory rate: 10–20 breaths per minute

**ڕێژەی هەناسەدان کەمتر لە هەشت هەناسەدان لە خولەکێکدا نیشانەیەکی مەترسیدارە و لەوانەیە پێویستی بە دەستێوەردان و یارمەتیێ هەبێت**

- ƒ ƒ Systolic blood pressure >90 mmHg
- ƒ ƒ Oxygen saturation >92%

**ئەگەر نەتتوانی پەستانی خوێن پێوانە بکەیت یان بەردەست نەبوو لەو کاتەدا دەتوانین پەڵس بەکاربهێنی بۆ خەملاندنی پەستانیی خوێنی نەخۆش . وەرگرتنی پەڵس لە بەشەکانی خوارەوەی جەستە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ خەملاندنی پەستانیی خوێنی سیستۆلیک لە گەورەکاندا (هەرچەندە ئەم ڕێگایە لەوانەیە کار نەکات لە کەسانی بەتەمەن واتە** elderly).

- Carotid (neck) pulse ≥ 60 mmHg
- Femoral (groin) pulse ≥ 70 mmHg
- Radial (wrist) pulse ≥ 80 mmHg

## NORMAL PAEDIATRIC VITAL SIGNS

**نیشانە زیندەگیەکان ( ڤایتەڵ ساین)لە منداڵاندا بەندە بە تەمەنەوە. لێدانی دڵی ئاسایی و هەناسەدان لە منداڵانی بچووکتردا زیاترە، هەروەها پەستانی خوێنی ئاسایی کەمترە. پێویستە خوێنهێنەری بڕاکیال (ناوەڕاستی قۆڵی نەخۆشەکە بەشی سەرەوە) بەکاربهێنرێت بۆ پشکنینی پەستانی خوێن لە کۆرپە و منداڵی بچووکدا.**

Normal paediatric vital signs

| AGE (in years) | NORMAL HEART RATE (beats per minute) |
|---|---|
| ≤1 | 100–160 |
| 1–3 | 90–150 |
| 4–5 | 80–140 |

| AGE | RESPIRATORY RATE (breaths per minute) |
|---|---|
| ≤2 months | 40–60 |
| 2–12 months | 25–50 |
| 1–5 years | 20–40 |



*Location of brachial pulse in a child*

- To estimate a child's (1–10 years old) weight in kilograms use the formula: [age in years + 4] x 2
- or use weight-estimation tools such as PAWPER, Mercy TAPE, or Broselow tape.
- Children are able to maintain normal blood pressure for longer than adults when they are in shock. You must check closely for signs of poor perfusion.
- The amount of IV fluid appropriate for children is different from that for adults.

MULTIPLE CHOICE QUESTIONS

Answer the questions below. Questions and answers will be discussed within the session.

1. A mother brings in her 3-year-old child because of difficulty in breathing. On assessment,

you hear loud, high-pitched sounds when the child breathes in. What is the most immediate

concern?

A. Severe infection

B. Shock

C. Asthma attack

D. Upper airway obstruction

2. An elderly woman fell at home. She had normal vital signs, but complained of neck and knee

pain prior to transport. During transport, she starts snoring and gurgling when taking a breath.

What is the most appropriate method to immediately manage this problem?

A. Placing her in the recovery position

B. Administering salbutamol

C. Jaw thrust

D. Head-tilt/chin-lift

3. A 50-year-old man has collapsed in a store and you are called to assist him. He is unconscious,

has a respiratory rate of four breaths per minute and a pulse of 100 beats per minute. The

collapse was witnessed and there is no trauma. What is the best next step?

A. Begin chest compressions

B. Open the airway

C. Begin bag-valve-mask ventilations

D. Check pupils

4. A 2-year-old boy is brought to you for being more sleepy than normal. He is unconscious. You

open his airway, and insert an oropharyngeal airway. What is your next step?

A. Check blood pressure

B. Check AVPU scale

C. Check glucose

D. Check breathing

5. You are listening to the lungs of a 26-year-old man who has sudden onset chest pain and he

is taking 30 breaths a minute. Which lung-sound finding is most suggestive of pneumothorax?

A. Crackles on both sides

B. Absent lung sounds on one side

C. Stridor

D. Wheezing on both sides

# Chapter 2: Approach to trauma

## ئامانجەکان

لە کاتی تەواوکردنی ئەم چاپتەرەدا زانیاریی وەردەگری دەربارەیی:

- ناسینی دۆزینەوە سەرەکییەکانی مێژوو کە ئاماژەن بۆ برینداربوونی مەترسیدار.
- ناسینی دۆزینەوەکانی پشکنینی جەستەیی کە ئاماژەن بۆ برینداربوونی مەترسیدار.
- ئەنجامدانی (Primary Survey) ڕاپرسی سەرەتایی زەبر (ڕێبازی ABCDE بۆ نەخۆشانی زەبر).
- ئەنجامدانی (Secondary Survey) ڕاپرسی لاوەکی زەبر (تاقیکردنەوەی زەبر لە سەر تا پێ).
- ناسینی برینە مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان.
- ئەنجامدانی دەستێوەردانی گرنگ بۆ حاڵەتە مەترسیدارەکان.

# تێڕوانینی گشتی

**بنەما گشتییەکانی چاودێریکردنی زەبر**

**ئەولەویەتەکان بۆ کەسێکی بریندار بریتین لە بەڕێوەبردنی بۆری هەوا و حاڵەتە فریاگوزاریەکانی هەناسەدان، کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوون، چارەسەرکردنی شۆک ونەجوڵان وجێگیرکردنی بڕبڕەکان ئەگەر پێویست بوو.**

**ئامانجی** (INITIAL ASSESSMENT) **دەستنیشانکردنی ئەو برینانەیە کە مەترسی لەسەر ژیان دروست دەکەن.**
**ئامانجی** (ACUTE MANAGEMENT) **دڵنیابوونە لە ئۆکسجین وپەرفیوژن، کۆنترۆڵکردنی ئازار و پلاندانان بۆ چاودێری بەردەوام.**

## نزیکبوونەوە لە نەخۆشێک کە زەبری بەرکەوتوە لە سێ قۆناغ پێکدێت

- Trauma primary survey: **ڕاپرسیی سەرەتایی زەبر بۆ کەسانی بریندار.**
- Sample history: **مێژووی نمونەیی: نیشانەکان، هەستیاری، دەرمانەکان، مێژووی پزیشکی ڕابردوو، دوایین خواردن کەسەکە خواردبێتی، و ڕووداوەکانی دەوروبەر.**
- Trauma secondary survey: **ڕاپرسی لاوەکی زەبر: پشکنینی تەواو لە سەر تا پێ بۆ گەڕان بەدوای برینەکاندا کە لەلایەن ڕاپرسی سەرەتاییەوە ( پرایمەری سێرڤەی)دەستنیشان نەکراون.**

## ABCDE: TRAUMA PRIMARY SURVEY

**ڕێبازی** ABCDE **لە نەخۆشە بریندارەکاندا زۆرجار پێی دەوترێت ڕاپرسی سەرەتایی زەبر. بۆ هەموو نەخۆشەکان ئەمە پێویستە لە ماوەی پێنج خولەکی یەکەمدا ئەنجام بدرێت و هەرکاتێک بارودۆخی نەخۆشەکە خراپتر بوو دووبارە بکرێتەوە. ئەم ڕێبازەی** ABCDE **تایبەت بە زەبر هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردنی سەرەتایی بۆ هەموو ئەو برینانەیە کە دەستبەجێ مەترسی لەسەر ژیان دروست دەکەن. هەمیشە گومانت هەبێت بۆ برینداربوونی سەر و بڕبڕەی پشت لە نەخۆشێکییێدا کە زەبری بەرکەوتوە و باری دەروونی گۆڕاوە.**

| باروودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Airway with cervical spine immobilization | سەیری ناو دەمی کەسەکە بکە بۆ (ڕشانەوە، دەرداو،زمان ، یاخود هەر تەنێکی نامۆ لە دەمی کەسەکەدا کە بۆتە هۆی گیرانی بۆری هەوا).سوتانی مووەکانی ناو لوت ،یان سوتاوی دەوری دەم و لێو، بەرکەوتنی زەبر بە سەرو مل، کۆبونەوەی خوێن لە ژێر پێستی مل(haematoma ،گۆڕانی باری هۆش و ئاگایی کەسەکە(گۆڕانکاری لەمەدا دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە بەتەواوی نەتوانێت کۆنترۆڵی بۆری هەوا بکات وە لەوانەیە بوونی هەر شتێک لە ناو دەمی ببێتە هۆی خنکاندنی) گوێ بگرە بۆ هەر دەنگێکی نائاسایی لە هەناسەدانی کەسەکە لەوانە Gurgling,snoring,stridor,noisy breathing. | نابێت بڕبڕەکانی پشت و مل جوڵەیان پێ بکرێت بدەبێت ڕێڕەوی هەوا بکەیتەوە تەنیا بە بەکارهێنانی تەکنیکی Jaw –thrust maneuver سەکشن بکە بۆ دەردراوەکانی دەم لەوانە خوێن یان ڕشانەوە،ئەگەر تەنی نامۆ لە دەمی کەسەکە هەبوو وە بینرا و توانرا دەربهێنرێت دەری بهێنە ئەگەر نا هەوڵ مەدە پاڵی پێوە بنێی بۆ ناوەوەی دەمی چونکە حاڵەتەکەی خراپتر دەبێت و ئەگەری هەیە بۆری هەوا بە تەواوی قەپات بکەیت. (Oral airway )لە ڕێگەی دەمەوە بۆ دابنێ بەڵام ئەگەر زەبرەکە بەر ڕوخساری کەسەکە کەوتبوو نابێ لە ڕێگەی لوتەوە بۆی دابنرێ ئەگەر نەخۆشەکە گومانی ئەوەی لێکرا سوتابێت یانیش خوێن بەربونی هەبوو لە ژێرەوەی پێستەکە لە ناوچەی مل راستەوخۆ پێویستە کار بۆ گواستنەوەی/ڕادەستکردنەووی بە پەلەی بکرێت. |

| باروودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Breathing | سەیربکە بۆ : زیادبوونی پێویستی هەناسەدان هەرجۆرە جوڵەیەکی نائاسایی لە سنگیدا کە لەوانەیە نیشانەبن بۆ (Flial chest,tracheal shift Sucking chest wound) سیانۆسیس( شین بونەوەی دەوری لێو و سەری پەنجەکان)سوربونەوە یان برین کە ئاماژەبێت بۆ برینداربوونی سنگ نەمان یان کەمبونەوەی ڕێژەی هەناسەدان, Circumferintial burn (burns that go all the way around a body part) to chest or abdomen گوێگرتن لە دەنگی سیەکان کە دەگۆڕێت بۆ Dull or hypperresonance Feel for crepitus(cracking and popping when pressing on the skin): | ئۆکسجینی پێ بدە و نیدڵ دی کۆمپرێشنی پێویستە بۆ ئە جام بدرێت دەستبەجێ وە ئۆکسجینی پێ بدرێت و لە ڕێگەی ئای ڤیەوە فلودی پێ دەدەین ئەگەر تێنشن نیومۆثۆراکس بوو (Place three-sided dressing for sucking chest wound) ئەگەر هەناسەدانی کەسەکە بەپێی پێویست نەبوو وە کەسەکە ڕێژەی ئۆکسجینی بەردەوام لە دابەزین بوو لەوکاتەشی ئۆکسجینی لەسەربوو. پێویستە یارمەتی هەناسەدانی بدەیت لە ڕێگەی Bag valve mask ventilation سوتاویی لە ناوچەی سنگ یاخود سک بوو کە هۆکار بوو بۆ کێشەی هەناسەو نەتوانینی هەناسەدان ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی نەخۆش بکە. |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Circulation | کاپیلەری ڕیفیلی زیاتر بێ لە سێ چرکە.<br>بێ ڕەنگی لە پەلەکان, خوێن بەربونی<br>ناوەکی و دەرەکی<br>Distended neck vein<br>سەرچاوە باوەکانی خوێن بەربونی<br>مەترسیدار : برین لە سنگ ، سک شکانی<br>حەوز ،شکانی ئێسکی ران، لێبونەوەی<br>یەکێک لە پەلەکان یانیش برینێکی<br>گەورە، سوتاوی زۆرو قوڵ.هەستکردن بە<br>(ساردیی پەلەکان و ساردبونەوەی و<br>زیادبوونی لێدانی دڵ) | پەستانیی ڕاستەوخۆ بۆ برینە بچوک و ئاساییەکان ، هەروەها لە برینە گەورەو قوڵەکاندا خوێن بەربونەکە ڕابگە بە بەکارهێنانی<br>(Deep wound packing)، ئەگەر یەکێک لە پەلەکان قرتابوو خوێن بەربونەکەش زیاد لە پێویست بوو تۆرنیکێت بەکاربهێنە بەلآم کاتی بەکارهێنانەکەی و ماوەکەی دۆکیومێنت و تۆماری بکە ، ئای ڤی فولدی پێویستە پێ بدرێت ڕاستەوخۆو دەسبەجێ کار بۆ گواستنەوەی/رادەستکردنەوەی بکرێت.<br>ئەگەر خوێن بەربونەکە هەر بەردەوام بوو وە نیشانەکانی کەمی ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین هەبوو لە جەستە ڕاستەوخۆ پێویستە<br>دوو کانولەی گەورەی بۆ دابنرێت و فلودی پێ بدرێت ، وە بەردەوام هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێتەوە.<br>ئەگەر سوتاوی بو بە گوێرەی ڕێژەی سوتاویەکەی فلودی لە ڕێگەی ئای ڤیەوە پێ دەدرێت<br>Splint suspected femur fracture<br>Blind pelvic fracture<br>ئەگەر هاتوو هەر تەنێک یان کەلو پەلێک پێستەکەی بریبوو وە برینێکی قوڵی دروستکردبوو هەوڵ مەدە بیهێنیتە دەرەوە چونکە خوێن بەربونەکە زیاتر دەکات بەڵکو بە جێگریی بیهێڵەرەوە ئەگەر ئافرەکە دوگیان بووەسەر لای چەپ دایبنێ لەکاتێکدا نابێ بڕبڕەکانی جوڵەیان هەبێ ئەگەر ئەم قۆناغە کێشەی نەبوو بڕۆ قۆناغی دواتر. |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Disability | هەڵسەنگاندن بکە بۆ : شلەژانی زۆر ،<br>بێتاقەتی و بێ وزەیی، گەشکە،<br>نایەکسانی لە بیلبیلەی چاوەکان،<br>ناتەواوی لە بەشی سەرەوە،خوین بەربون<br>یان بونی دەردراو لە لوت و گوێ.<br>پشکنین بکە بۆ AVPU OR GCS<br>جوڵەو هەستەوەرەکان لە هەموو پەلەکان<br>ئەگەر بی هۆشبوو یانیش شلەژابوو کەسەکە<br>ڕێژەی گلوکۆزی خوێنی پێوانە بکە. | If GCS <9 or<br>for children<br>P or U  In AVPU score<br>ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بۆ دابینکەرێکی پێشکەوتوو توانای چاودێری کردنی وردی ڕێڕەوی هەوای هەبێت.<br>ئەگەر نەخۆشەکە زۆر بێتاقەت و بێ هێز بوو یانیش هۆشی نەمابوو پێویستە پشکنین بکەین بۆ ڕێرەوی هەوا بە بەردەوامی گومانی ئەوە دابنی زیان بەر سەرو مل کەوتبێ لە هەر حاڵەتێکی گۆڕانکاری لە هۆش و ئاگایی کەسەکە ئۆکسجینی پێ بدە ئەگەر گومانی ئەوە هەبوو ڕێژەی ئۆکسجینی بە هۆی زەبرەوە دابەزیبێ گلوکۆزی پێ بدە ئەگەر هاتوو هیچ ئامێرێک لانەبوو ڕێژەی شەکری خوێنی پێوانە بکەیت یانیش کەمبوو ڕێژەی شەکری خوێن ، یان کەسەکە شەکرەی هەبوو ئەگەر گەشکەی لێهاتبوو پێوسیتە بێنزۆدایەزیپینی پێ بدرێت. |

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Exposure | جل و بەرگەکانی لابە هەروەها پشکنین بۆ تەواوی جەستەی بکە لە هەموو لایەکانەوە بۆ بوونی هەر برینێک پێویستە پشکنین بۆ جەستەی کەسەکە بکەی لە ڕێگەی تەکنیکی Log roll maneuver. | ئەگەر کەسەکە زەبری بەرکەوتبوو پێویستە لە ڕێگەی لۆگ رۆڵ مانیوڤەرەوە پشکنینی بۆ بکرێت، لابردنی هەموو جۆرە جل و بەرگێکی تەسک یانیش خشڵ و ئێسکسسوارات،لابردنی جل وبەرگی تەڕ هەروەها وشک کردنەوەی نەخۆش بەبەردەوامی داپۆشینی نەخۆش بۆ ڕێگری لە دابەزینی پلەی گەرمی جەستە چونکە بە قورسی دەتوانن کۆنترۆڵی پلەی گەرنی جەستەیان بکەن ئەو کەسانەی بریندار بوون، ڕێز و ئەخلاقیی پیشەیی بپارێزە ئەوکاتەی بەرکەوتنت لەگەڵ نەخۆش هەیە. |

# DO: IMPORTANT CONDITIONS TO RECOGNIZE AND MANAGE IN THE PRIMARY SURVEY

## AIRWAY CONDITIONS

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Airway Obstruction | بونی دەردراو، خوێن ، ڕشانەوە،تەنی نامۆ یاخود زمانی نەخۆشەکە کە بوبێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەوا ،گۆڕانی دەنگی نەخۆش.<br>دەنگی نائاسایی لەوانە (Stridor,snoring,guegling)<br>خوێن بەربون لە ژێرەوەی پێستی مل، سوتاوی لە ناوچەی سەر و مل ،گۆڕانکاری لە باری هۆش و ئاگایی لەوانەیە ببێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەناسە،کەمبونەوەی کشانی قەفەزەی سنگ لەکاتی هەناسەدان، هەر جۆرە برینێک ببێتە هۆی ئاوساونی بۆری هەوا لەوانە سوتاویی یانیش هەستیاریی توند. | زیان گەشتن بە سەر و مل لەوانەیە لە ئەنجامی گیرانی ڕێڕەوی هەناسەبێت بە (خوێن، ڕشانەوە،دەردراو،تەنی نامۆ،یانیش ئاوساویی) برینی کراوە لەوانەیە ببێتە هۆی زیادبوونی بڵاوبونەوەی خوێن لە ژێر پێست و گیرانی بۆری هەوا ئەو سوتاویانەی لە ئەنجامی هەڵمژینەوە بون بە نمونە هەڵمژینی مادەی کیمایی ئەگەری هەیە ببێتە هۆی گیرانی ڕێڕەوی هەناسە.<br>ئەو نەخۆشانەی گۆڕانکاری لە باری هۆش و ئاگاییان ڕویداوە هەندێک جار تواناى نیە کۆنترۆڵی ڕێڕەوی هەناسەی بکات بۆیە پێویستە بەردەوام چاودێری بکەین بۆ بونی هەر دەردراوێک کە لەوانەیە ببێتە هۆی خنکانی.<br>ئەگەر توانرا تەنە نامۆکە لە دەمی نەخۆش دەربهێنە هەروەها سەکشنی بۆ بکە لە ئەو نەخۆشانەی زەبریان بەرکەتوە دەتوانین ڕێڕەوی هەوا بکەینەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکی(Jaw-thrust-maneuver)<br>هەروەها ئەگەر پێویست بوو تیوبی بۆ دادەنرێ لە ڕێگەی دەمەوە. ئەگەر پێویست بوو بڕبڕەکانە مل و پشت بە نەجوڵاوی بهێڵەرەوە.<br>ڕاستەوخۆ پێویستە کار بۆ گواستنەوەی بەپەلەی نەخۆش بکرێت |

## BREATHING CONDITIONS

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Tension pneumothorax | دابەزینی پەستانی خوێن لەگەڵ کۆمەڵێک نیشانەی دیکە لەوانە:<br>زەحمەتی لە هەناسەدان، لە کاتی فیزیکاڵ ئێگزامینەیشین ئەو دەنگەی گوێت لێدەبێ هایپەر ریزۆنانسە، نەمانی دەنگ یان کەمبونەوەی لەو لایەی کە توشبوە ، لەگەڵ کۆمەڵێک نیشانەی دیکە لەوانە (Distended neck vein, tracheal shift away from affected site) | هەموو جۆرەکانی نیوموثۆراکس ئەگەری هەیە ببێتە تێنشن نیوموثۆراکس . بوونی هەوا لە ناو ئەو دوو پەردەیەی دەوری سیەکان لەوانەیە ببێتە هۆی تێکشکانی سیەکان) (simple pneumothorax)،زیادبوونی پەستانیش (tension)دەبێتە هۆی گیرانی ئەو خوێن بەرە سەرەکیەی خوێن بۆ دڵ دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ کە ئەمەش دەبێتە هۆی شۆک<br>ئەگەر نیشانەکانی نیوموثۆراکسی تیابوو ڕاستەوخۆ پێویستە (needle decompression) ئەنجام بدە و ئۆکسجینی پێ بدرێت ، هەروەها لە ڕێگەی ئای ڤیەوە فلودی پێویستە پێ بدە<br>راستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی نەخۆشەکە بکە. |

| | | |
|---|---|---|
| Sucking chest wound (open pneumothorax) | بوونی برینێکی کراوە لە سنگی نەخۆش کە وا دەکات هەوا بچێتە ناوەوە کە ئەمەش وا دەکات نەخۆشەکە بە زەحمەت هەناسە بدات و ئازاری سنگی زۆربێت. | ناسینەوەی ئەم حاڵەتە زۆر گرنگە چونکە لەوانەیە لە ماوەیەکی کەمدا ببێتە (Tension pneumothorax)، هەوا بچێتە نێوان قەفەزی سنگ و سیەکان لەو برینەی کە لە سنگی نەخۆشەکەدایە کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی پەستان لەسەر سییەکان. ئۆکسجینی پێویستە پێ بدرێت<br>ڕێگە بە هەوا دەدەین لە سییەکان دەربچێت لەکاتی هەناسە دانەوەو ڕێگری لە چونە ژورەوەی دەکەین لەکاتی هەناسەوەرگرتن لەڕێگەی تەکنیکی: (Three side dressing)<br>پێویستە نەخۆشەکە بە بەردەوامی چاودێری بکرێت چونکە ئەگەر هەیە دوای بەکارهێنان و ئەنجامدانی ئەم تەکنیکە ئەو گۆزەی بەکارمان هێناوە بنوسێت بە سنگەوە کە ببێتە هۆی مەیینی خوێن و گۆڕان بۆ (Tension pneumothorax)<br>درێسینگەکە لابەرە ئەگەر زانیت هەناسەدانی کەسەکە خراپتر بوە یان نیشانەکانی کەم ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین بۆ جەستە هەبو ڕاستەوخۆو بەپەلە کار بۆ گواستنەوەی نەخۆش بکە بۆ نەخۆشخانە |
| haemothorax | قورسی هەناسەدان،کەمبونەوەی دەنگی هەناسە لەو لایەی توشبوە ، لەماوەی پێرکەشن دەنگی سیەکان دەگۆڕێت بۆ دەڵ، ئەگەر هیمۆثۆراکسەکە زۆربوو ئەگەری ئەوەی هەیە ببێتە شۆک<br>واتە بونی خوێن لەنێوان سیەکان دیواری سنگ کە نیشانەکانی بریتین لە نەمانی دەنگی هەناسە و هەبوونی دەڵ لەماوەی پێرکەشن لەو شوێنە. | ئۆکسجین و ئایڤی فلودی پێ بدە.<br>ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی بکە بۆ نەخۆشخانە. |
| Flail chest | قورسی هەناسەدان، ئازاری سنگ، بەشێکی سنگ بە پێچەوانەی بەشەکەی تریەوە جوڵە دەکات لەماوەی هەناسەدان. | ئەم حاڵەتە کاتێک ڕوودەدات کە پەراسوەکانی کەسەکە دەشکێن و پارچە پارچە دەبن کە ئەمەش وادەکات بە ئازادانە جوڵە بکەن لە قەفەزەی سنگدا بە بێ ئەوەی بەسترابن بە دیواری سنگەوە ،هەروەها ئەم جوڵە نائاساییانە ڕێگری لە کشانی قەفەزەی سنگ دەکەن لە ماوەی هەناسەدان و دەکرێت ببنە هۆی تێکشکانی شانەکانی ناوەوەی سییەکان.<br>ئۆکسجینی پێ بدە.<br>ئەگەری زۆری کەمبونەوەی ئۆکسجین و هەناسەدانی هەیە کەسەکە ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی بکە. |

# DISABILITY CONDITIONS

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
| --- | --- | --- |
| Hypovolaemic shock | نیشانەکانی بریتین لە زیادبوونی لێدانی دڵ و زیادبوونی هەناسەدان ، پێڕەنگی پێست کاپیلەری ریفیلی خاو دەبێتەوە لەوانەیە هەست بە گێژبون و وڕبون بکات یانیش بشلەژێ و باری هۆش و ئاگایی گۆڕانکاری بەسەردا بێت ، پەستانی خوێنی دابەزێت، خوێن بەربونی ناوەکی یانیش دەرەکی بوونی هەبێ بەتایبەت کە سنگ و سک و ناوچەی حەوز یان ڕان، لولە خوێنەکان. | ڕوودەدات کە ئەنجامی لەدەستدانی بڕێکی خوێنی جەستە لەناکاو هەربۆیە پێشی دەوترێت هیمۆرهەیجیک شۆک،یانیش لە ئەنجامی لەدەستدانی شلەی لەش بەهۆی سوتاویەوە ڕوودەدات.<br>لەوانەیە نەخۆشەکە تەنیا لێدانی دڵی خێرابێت یان هەناسەدانی خێرابێت هەروەها پەستانی خوێنی دانەبەزێت هەتاوەکو حاڵەتەکەی مەترسی لەسەر ژیانی دروست دەکات بۆیە تەنانەت ئەگەر پەستانی سیستۆلیکی نەخۆش زیاتر بوو لە نۆ هێشتا گومانی شۆکی لێدەکرێت ئەگەر بێت و خوێنبەربونی هەبێ یانیش نیشانەی کەمی ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین بۆ جەستە هەبوو لەوانە(ساردی پەلەکان، بێ ڕەنگی پێست،کاپیلەی ریفیلی زیاد بکات،زیادبوونی هەناسەدان، شڵەژاوی)<br>بۆ وەستاندنی خوێن بەربونەکە ئەم تەکنیکانە بەکاربهێنە:<br>(Direct pressure,deep wound packing,tourniquet,splinting of fractures and binding the pelvic if need)<br>ئایڤی لاینی بۆ دادەنرێت و فلودی پێ دەدرێت<br>ئەو نەخۆشانەی گومانی (Haemothorax) یان خوێنبەربونی ناوەکیان لێدەکرێت ڕاستەوخۆ پێویستە کار بۆ گواستنەوەیان بکرێت |
| Pericardial tamponade | نیشانەکانی کەمی پەرفوژن(لەوانە دابەزینی پەستانیی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ،زیادبوونی هەناسەدان،سپی هەڵگەڕانی پێست،ساردبونەوەی پەلەکان،کاپیلەری ریفیلی زیاتر بێ لە سێ چرکە.<br>Distended neck vein<br>Muffled heart sound<br>لەوانەیە نەخۆشەکە هەست بە وڕبوون،شڵەژان بکات یان باری دەروونی بگۆڕێت). | کاتێک شلە کۆدەبێتەوە لەو پەردەیەی دەوری دڵی داوە ئەمە وادەکات پەستان لەسەر ژوورەکانی دڵ دروست ببێت و وادەکات دڵ بە باشی نەتوانێت پاڵ بە خوێنەوە بنێت بۆ جەستە،<br>لە ڕێگەی ئای ڤیەوە فولدی پێ بدە بۆ یارمەتیدانی دڵ لە پەمپکردنی خوێن.<br>نەخۆشەکە ڕاستەوخۆ دستبەجێ پێویستی بە گواستنەوە/ڕادەستکردنەوە هەیە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتو. |

# EXPOSURE CONDITIONS

| بارودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Severe head injury | گۆڕانکاری لە بینین،لەدەسدانی بیرەوەری،گەشکە،ڕشانەوە،سەرئێشە گۆڕانکاری لە باری هۆش و ئاگایی نەخۆش، بوونی برین لە سەری نەخۆش، سوربونەوەی بەشەکانی سەری نەخۆش بەتایبەت دەوروبەری چاو یان پشتەوەی گوێ، هاتنە دەرەوەی خوێن یان شلە لە لوت یان گوێ نەخۆش ،نایەکسانی لە بیلبیلەی چاوەکانی نەخۆشەکە، لاوازی لە یەک لای جەستە. | زیان گەشتن بە مێشک دەکرێت لە( mild bruising) یکەوە بێت تا (severe bleeding)<br>چونکە مێشک لە کەللەسەرێکی ڕەقدا داپۆشراوە هەر هەڵئاوسان و خوێنبەربوونێک دروست ببێت برینەکە بە خێرایی دەبێتە مەترسی لەسەر ژیان.<br>چاودێری باری هۆش و ئاگایی نەخۆش بکە.<br>ئەو نەخۆشانەی ناجوڵێن پێویستە هەمیشە چاودێری بکەیت بۆ هەر ڕشانەوەیەک چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی خنکان. ئەگەر گومان لە هەر شکاویەک لە کەللەی سەر هەبوو برینەکە کراوەبوو دەرمانی دژە بەکتریای پێ بدە، وە ئەگەر بۆ بەرکەوتنی زەبر بە بڕبڕەکان لەبەرچاو بگرە هەر بۆیە لە ڕێگەی( log roll maneuver )ەوە پشکنینی بۆ بکەو دورکەوە لە جوڵەکردنی زۆر بە نەخۆش<br>بیرت نەچێت پێویستە زوو زوو پشکنینیABCDE بۆ بکرێت.هەموو کات پشکنین بۆ شەکرەی نەخۆشەکە بکە، وە هەرگیز لە ڕێگەی دەمەوە خواردن و خواردنەوەی پێ مەدە.ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بەپەلەی بکە. |

لەبیرت بێت... ئەو کەسانەی کە سەرەتا بە باشی دەردەکەون لەوانەیە برینێکی شاراوەیان هەبێت کە مەترسی لەسەر ژیانیان هەیە، وەک خوێنبەربوونی ناوەوە. زۆر گرنگە کە زوو زوو نەخۆشانی بەرکەوتەی زەبر هەڵسەنگێندرێتەوە.

ئەگەر بە بەکارهێنانی (primary survey) کێشەیەکت دۆزیەوە و بەڕێوەت  برد، گەڕانەوە و دووبارەکردنەوەی (primary survey)ەکە زۆر گرنگە بۆ دەستنیشانکردنی هەر کێشەیەکی نوێ و دڵنیابوون لەوەی کە چارەسەری دەکەیت. بە شێوەیەکی گشتی پێویستە ڕێبازی ABCDE هەر 15 جارێک ئەنجام بدرێت و دووبارە پشکنین بکرێتەوە لەگەڵ هەر گۆڕانکارییەک لە بارودۆخدا.

پێویستە لە کۆتایی ڕاپرسیە سەرەتاییەکەدا (vital signs) نیشانە زیندەگیەکان بپشکنرێت.

کۆمەڵەیەکی تەواو لە نیشانە زیندەگیەکان (پەستانی خوێن، لێدانی دڵ، لێدانی هەناسەدان و تێربوونی ئۆکسجین ئەگەر هەبێت(پێویستە دوای ڕاپرسیە سەرەتاییەکە ئەنجام بدرێت. دەستێوەردانەکانی ڕاپرسی سەرەتایی بۆ نیشانە گرنگەکان دوا مەخە.

# ASK: KEY HISTORY FINDINGS FOR TRAUMA PATIENTS

زانیاری دەربارەی کەسی بریندار و ڕووداوی بریندار دەکرێت گرنگ بێت بۆ بەڕێوەبردنی حاڵەتەکەو پلاندان بۆی . بێگومان (مندالآن، بەساڵاچووان و ئەو کەسانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە)مەترسی تووشبوونیان بەو ئاڵۆزییانەی بەهۆی زەبرەوە دروست دەبێت زیاترە. لەوانەیە پێویستیان بە چاودێری  بێت بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک تەنانەت کاتێک بەباشی دەردەکەون. هەندێک حاڵەت هەیە زۆرجار پەیوەندی بە چەندین برینداربونەوە هەیە، کە هەندێکیان لەوانەیە یەکسەر ئاشکرا نەبن و دەرنەکەون لە کەسەکەدا .

حەڵەتە مەترسیدارەکان بریتین لە

- پیادەیەک لەلایەن ئۆتۆمبێلێکەوە لێدەدرێت.
- پێکدادانی ماتۆرسکیل یان هەر پێکدادانێکی ئۆتۆمبێل لەگەڵ سەرنشینان.
- لە بەرزایی زیاتر لە 3 مەتر کەسەکە دەکەوێتە خوارەوە (یان لە مندالآن،دوو هێندەی بالآی منداڵ بێت ئەو بەرزیەی لێی کەوتۆتە خوارەوە)
- برینداربوون بە هۆی گوللە یان چەقۆ
- SAMPLE بەکاربهێنە  بۆ بەدەستهێنانی هیستریی(مێژوو). لەبیرت بێت کە لەوانەیە بتوانیت زانیاری لە ڕێبوارەکان، خێزان، پۆلیس، ئاگرکوژێنەوە یان کارمەندانی تەندروستی تر وەربگریت.

## ☒ نیشانەکان(sign and symptoms)

**ئایا مێژووی دەنگێکی بەرز یان زبر هەیە، یان گۆڕانی دەنگێکی دیکە؟گۆڕانکاری لە دەنگ لە کاتی برینداربوونی سەر، مل یان سوتاودا لەوانەیە ئاماژە بەوە بکات کە ڕێڕەوی هەناسەدان هەڵئاوساوە و لەوانەیە بەربەست بگرێت.**

**ئایا هیچ کێشەیەک لە هەناسەدان هەیە؟**

**کێشەی هەناسەدان لەوانەیە بە تێپەڕبوونی کات گەشە بکات و لە سەرەتادا بوونی نەبێت ، لێکۆڵینەوەی سەرەتایی**(Primary survey)**.کێشەی هەناسەدان لەوانەیە بەڵگەی ئەوەمان باتێ کە کەسەکە برینێکی هەیە لە شوێنێکی جەستەی( سییەکان، پەراسووەکان، ماسولکەکان، دیواری سنگ یان بڕبڕەی پشت).**

**ئایا خوێنبەربوون هەیە؟**

**بەزۆری بۆ نەخۆشەکان زۆر زەحمەتە بتوانن قەبارەی لەدەستدانی خوێنەکە بزانن بەڵام ئەگەر توانیبووی لەوانەیە ئەمە یارمەتیدەربێت ئەوەی کە زانینی ماوەی چەندە خوێن بەربوون هەیە، چەند لەفاف تەڕ بووە وە ئەگەر خوێنبەربوونەکە سووکتر یان قورستر بوو. ئایە نەخۆشەکە نیشانەی شڵەژاوی هەیە، یانیش زیاد لە پێویست خەواڵوە؟ شڵەژاوی لەوانەیە لە ئەنجامی بەرکەوتنی زەبرەوە دروستت بێ بۆ سەر، یان کەمی ئۆکسجین یان شۆک (کەم ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین بۆ مێشک)، هەر بۆیە بەرکەوتنی زەبر بەسەر لەوانەیە ببێتە هۆی خوێنبەربون یان زیادبوونی پەستان لەسەر مێشک کە ئەمەش دەبێتە هۆی شڵەژان،خەواڵووی، کۆما**

**ئایە ئازاری هەیە؟شوێنی ئازارەکە کوێیە؟ ئازارەکە چۆنە؟زۆرە یان کەم؟**

**ئازار هەمیشە نیشانەی زیانپێکەوتنە لە ناوەوە.سەرئێشەش نیشانەی ئەوەیە کەسەکە زیان بەر کەللەی سەری یان مێشکی کەوتوە،ئازار لە دڕکەپەتک و بڕبڕەی پشت لەوانەیە نیشانەبێ بۆ بەرکەوتنی زەبر بەو ناوچەیەو ئەگەری هەیە بە پێی کات خراپتر بێت و بێتە هۆی زیانگەیاندن بە دڕکە پەتک. ئازار لە سنگ یان سکدا لەوانەیە نیشانەی زیان گەشتن بێت بە دڵ ،سیەکان ، یانیش ئەندامەکانی دیکەی ئەو ناوچەیە. ئازار لە ناوچەی حەوز لەوانەیە نیشانەبیت بۆ شکانی ئێسکەکانی ئەو شوێنە کە ئەمەش ئەگەری هەیە ببێتە هۆی خوێن بەربونی مەترسیدار بۆسەر ژیانی کەسەکەو ببێتە شۆک. ئازار لەوانەیە یەکەم نیشانەی بەرکەوتنی زیانی ناوەکی بێت لە سنگ و سک و حەوز.**

**ئایە ڕشانەوەو هێڵنجدانی هەیە؟**

**ڕەنگە نیشانەی هەبووبی زەبر بێت بە سک یان سەر**

**ئایە هیچ نیشانەیەکی بێهێزی یان مێرولەکردن هەیە ؟**

**ڕەنگە نیشانەبێت بۆ زیانکەوتن لە بڕبڕەی پشت و دڕکەپەتک.**

ئایە نیشانەی گۆڕانکاری لە بینینی کەسەکەیا هەیە؟ بەرکەوتنی زەبری ڕاستەوخۆ بە چاو، شکانی ئێسکەکانی دەوری چاو،بەرکەوتنی زەبر بە سەر و زیان کەوتن لێی هەموو ئەوانە لەوانەیە هۆکارێن بۆ گۆڕانکاری لە بینینی کەسەکەدا.

☒ Allergy

ئایە نەخۆشەکە هەستیاریی بەرامبەر هیچ دەرمانیک هەیە؟

☒ Medication

کەسەکە چ دەرمانێک بەکاردەهێنێت؟بە نمونە ئەو دەرمانانەی کار لە خەستی خوێن و مەیینی دەکەن وەک ئەسپرین یان وارفارین وا دەکەن ئەگەر خوێن بەربونی هەبوو زۆر بە زەحمەت کۆنترۆڵ ببێت، یان دەرمانەکانی زەخت وا دەکەن بە زەحمەت کۆنترۆڵی شۆک بکرێت. لیستی هەموو دەرمانەکانی نەخۆش تۆماربکە ئەگەر پێویستی کرد لە خێزانەکەی داوا بکە هەمووی لەگەڵ خۆیان بهێنن.

☒ Past medical history

ئایە کەسەکە دوگیان نیە؟

ئەمەش لەبەر ئەوەیە دووگیانی دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێک لە ئەندامەکانی ناوەوە شوێنەکانیان لە شوێنە ڕاستەقینەکەی گۆڕانی بەسەردابێت ، بۆیە پێویستە لەکاتی بەڕێوەربردن و یارمەتی دانیان لەوکاتەی زەبریان بەرکەوتوە لەبەرچاوبگیرێت. ئەو ئافرەتانەی منداڵیان بوە هەمیشە پرسیاری کۆتا سوڕی مانگانەی لێبکە

Vaccination: ئەو کەسانەی زەبریان بەرکەوتوەو ئەگەری هەیە ببێتە هۆی زیانگەیاندن و تێکشکانی پێستەکە ،هەە بۆیە ئەو کەسانەی لەماوەی پێنج ساڵی پێشوو ڤاکسینی (Tetanus) نەکردوە پێویستە بۆیان بکرێت.

☒ L: LAST ORAL INTAKE

دوایین جار کەسەکە کەی خواردنی خواردووە یان خواردووەتەوە؟

☒ E: EVENTS SURROUNDING INJURY

هەندێک میکانیزمی برینداربوون ئەوەندە مەترسیدارە کە پێویستە لە نزیکەوە چاودێری نەخۆشەکان بکرێت، تەنانەت ئەگەر وا دەرنەکەوێت کە بە شێوەیەکی بەرچاو بریندار بوون.

- ئایا لە 3 مەتر یان زیاتر (یان دوو هێندەی بەرزی لە منداڵان)کەوتنە خوارەوە هەبووە؟ کەوتن هۆکارێکی باوی برینداربوونە بۆ هەردوو کەسی گەورە و منداڵ. مەودای زیاتری کەوتنە خوارەوە ئەگەری برینداربوونی سەخت زیاد دەکات. زۆرجار کەوتنەخوارەوە لە گەورەکاندا پەیوەندی بە( تەمەنی گەورەتر، سەرخۆشی کحولەوە هەیە، یان لەکارکەوتنی ئامێرەکانی شوێنی کار، لەوانەش پلیکانەکان)هەیە. زۆرجار منداڵان لە پەنجەرە یان باڵکۆن دەکەونە خوارەوە.
- ئایا پیادە یان پاسکیلسوارێک ئۆتۆمبێلێک لێی داوە؟

ئەو گەورەساڵ و منداڵانەی کە ئۆتۆمبێلێک لە کاتی ڕۆیشتن یان بەکارهێنانی فۆرمەکانی گواستنەوەی لێی دەدەن، هەمیشە مەترسییەکی زۆریان لەسەرە بۆ برینداربوونی سەخت. لەوانەیە منداڵانی بچووک کەمتر لە گەورەکان بتوانن ڕووداوەکان ڕاپۆرت بکەن، تەنانەت ڕووداوە گەورەکانی وەک لێدانی ئۆتۆمبێل. هەمیشە ئەگەری زەبری بێ شایەتحاڵ لە منداڵانی بچووکدا لەبەرچاو بگرە. منداڵان و گەورەکان دەتوانن تووشی چەندین برینداری ببن کاتێک ئۆتۆمبێلێک لێیان دەدات – چ لە بەرکەوتنی ڕاستەوخۆ بۆ جەستە، بەتایبەتی پەلەکانی، هەروەها لە کاریگەری لاوەکی ئەگەر فڕێدرانە سەر جامی پێشەوە یان ڕێگاکە، کە لەوانەیە ببێتە هۆی بریندابوون لە هەر شوێنێکی جەستەدا، لەوانە( سەر، مل، سنگ یان ئەندامەکانی جەستە).

- لە ڕووداوێکی ماتۆڕسکیل دا، ئایە شۆفێرەکە فڕێدراوە؟

زۆرجار پێکدادانی ماتۆڕسکیلەکان دەبێتە هۆی فڕێدانی کەسەکە. بپرسە ئایا ماتۆڕسوارەکە کڵاوی لەسەردا بووە و سوارەکەی چەند لە ئۆتۆمبێلەکەوە دووربووە. شوێنە باوەکانی بریندابوون بریتین لە( سەر بڕبڕەی پشت، سنگ، سک و حەوز، هەروەها ئەندامەکان و پێست

- ئایا ڕووداوی هاتوچۆی ڕێگاوبان بە خێرایی زۆر ڕوویداوە؟ ئایا کەسەکە لە ئۆتۆمبێلێکەوە فڕێدراوە یان لەناو ئۆتۆمبێلێکدا گیری خواردووە؟ ئایا هیچ سەرنشینێکی ئۆتۆمبێل لەم ڕووداوەدا گیانی لەدەستداوە؟

لەگەڵ ڕووداوی خێراتردا، هێزێکی زیاتر دەگوازرێتەوە بۆ سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکان کە مەترسی بریندابوونی سەخت زیاد دەکات. لەوانەیە سەرنشینانی ئۆتۆمبێل بەهۆی بەرکەوتن بە جامی پێشەوە یان سوکان، یان بەهۆی ئەو هێزانەی کە لە ئەنجامی وەستانی لەناکاوی ئۆتۆمبێلەکەوە دێنە ئاراوە بریندار ببن. ئەو کەسەی لە ئۆتۆمبێلێکەوە فڕێدراوە مەترسی زۆر بەرزی هەیە بۆ بریندابوونی سەخت. ئەگەر کەسێک لەناو ئۆتۆمبێلێکدا گیری خواردبێت گرنگە بزانیت چ بەشێکی جەستەی گیری خواردووە (قۆڵ/قاچ بە نمونە) بۆ چەند کاتژمێرە لەوێ گیری خواردووە. بیر لە بریندابوونی سەخت بکەرەوە لە کەسێکدا کە گیری خواردووە. گیانلەدەستدانی لە شوێنی ڕووداوێکی هاتوچۆی ڕێگاوبان ئەوە دەردەخات کە هێزێکی بەرچاو بەسەر ئۆتۆمبێلەکە و سەرنشینەکانیدا کەوتووە. هەموو ئەو سەرنشینانەی وا دەرکەون کە ئازاریان پێنەگات، مەترسییەکی زۆریان لەسەرە بۆ بریندابوونی سەخت.

- لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا، ئایا نەخۆشەکە پشتێنەی سەلامەتی بەستووە؟

هەندێک جۆری بریندابوون زیاتر لەو نەخۆشانەدا ڕوودەدات کە پشتێنەی سەلامەتییان نەبەستووە (فڕێدانیان لە ئۆتۆمبێلەوە، لێدانی سەر لەسەر جامی پێشەوە، لێدانی سنگ ).

- ئایا چەک بەکارهاتووە؟

هەر کاتێک مێژووی برینێکی چەقۆ یان تەقە هەبوو، لەوانەیە چەندین برین هەبێت. هەمیشە پشکنینی تەواوی جەستە بۆ برین.

ئایا سووتاوی هەبووە؟ چ جۆرە سووتاوییەک بووە؟

سووتانی ئاگر (سووتانی بڵێسە) زۆرترین جۆرە هەروەها مێژووی سووتانی بڵێسە لە شوێنێکی داخراودا دەتوانێت پێشنیاری هەناسەدان یان برینداربوونی بۆری هەوا بکات، سووتانی پێست (بەهۆی شلەی گەرمەوە) لە منداڵاندا باو و ئاساییە،زۆرجار برینداربوونی کارەبا لە سەرچاوەی ڤۆڵتیەی بەرزەوە وەکو وایەرەکانی کارەبای سەرەوە کە بەرکەوتنیان لەگەڵ جەستەدا هەیە. لە ڕووکەشدا ئەم برینانەی کارەبایی ڕەنگە بچووک دەرکەون بەڵام دەتوانن ببنە هۆی تێکچوونی بەرفراوانی شانە و ماسولکەکان. زۆرجار نیشانەکانی سووتانی چوونە ژوورەوە و دەرچوون بەجێدەهێڵێت. لە حاڵەتی سووتانی کیمیاییدا، ڕەنگە زانیاری لەسەر ماددە کیمیاییە تایبەتەکە پێویست بێت بۆ ئەوەی بە باشی لاببرێت.

- بۆ سووتان، ئایا فریاگوزاری سەرەتایی لە شوێنی ڕووداوەکە کراوە؟

گرنگە بزانین ئایا پرۆسەی سووتاندنەکە وەستاوە، و لە ئەگەری ڕوودانی ماددەیەکی کیمیایی بەرکەوتن، ئەگەر پاککردنەوە ئەنجامدرابێت. ئەگەر تەمەنی سووتاوییەکە لە ٣ کاتژمێر کەمتر بوو و یەکەمجار نەبوو و یارمەتی پێشکەش کرابوو، برینەکە پێویستی بە شۆردن دەبێت بە ئاوی پاک بۆ وەستاندنی پرۆسەی سووتاویی ، ئەگەر پێشینەی بەرکەوتنی ماددە کیمیاییەکان هەبوو خۆت بپارێزە لە ماددە کیمیاییەکە .

- ئایا کەسەکە بریندار بووە بەهۆی (crush injury)ەوە؟ ئازارێکی زۆر هەیە یان بێهێزی هەیە؟ ئایا تاریکی هەیە لە میز واتە ڕەنگی میزەکەی زۆر تێرە؟

(crush injury)لەوانەیە زیان بە پێست و ماسولکە و خوێنبەرەکان و ئێسک بگەیەنن. ماسولکەی تێکچوو دەتوانێت بەرهەمێکی لاوەکی ماسولکەیی (کە پێی دەوترێت مایوگلۆبین) دەربدات کە دەتوانێت کۆببێتەوە و زیان بە گورچیلە بگەیەنێت .

گرنگە بزانین ئەندامێکی جەستە چەندە ورد بووە. تەنانەت شوێنێکی بچووکی وردکراو دەتوانێت ببێتە هۆی دەردانی بڕێکی مەترسیدار لە مایوگلۆبین (بۆ نموونە کاتێک ئەندامێک لە ژێر پاشماوەی کەوتوودا بۆ ماوەیەکی درێژ دەگیرێت). ئەگەر کەسەکە میزی ڕەش بوو، ئەمە ڕەنگە نیشانەی کۆبوونەوەی مایوگلۆبین بێت لە گورچیلەکاندا

ئایا کەسەکە بە تەقینەوە بریندار بووە؟

برینداربوونی تەقینەوە (لە تەقینەوە) دەتوانێت هەموو سیستەمەکانی جەستە بگرێتەوە، بەتایبەتی برینە باوەکانی تەقینەوە بریتین لە (تێکچوونی سییەکان و ڕیخۆڵەکان و گوێیەکان). ئەو نەخۆشانەی لە تەقینەوەکاندا بوون یان نزیک بوون پێویستیان بە پشکنینی ورد و دووبارە و دووبارە هەیە چونکە ئەم برینانە بە ئاسانی لەدەست دەچن و ون دەبن. هەروەها لەوانەیە تەقینەوە پەیوەندی بەوە هەبێت ئایا بە تەنی نامۆ لە پێست و چاودا هەبێت، سووتاوی یان برینداربوونی کیمیایی و بەرکەوتنی ژەهر یان تیشکدانەوە بەشێکی ترن لە هۆکاری برینەکان.

# CHECK: TRAUMA SECONDARY SURVEY

**دوابەدوای** (primary survey) **و** (SAMPLE history) **و**(secondary survey) **دێت کە لە سەری نەخۆشەکە تا پێی پێویستە پشکنینی وردی بۆ بکرێت بۆ هەر کێشەو برینێک کە چارەسەری پێویست بێت. بێگومان ئەم رێگەیە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی بە تەواوی جەستەی کەسەکە بپشکنی بۆ بونی هەر نیشانەیەکی زەبر کە لە** (primary survey) **تۆمارنەکراوە، بەڵام ئاگاداربە لەوانەیە هەندێک جار کە حاڵی نەخۆشەکە زۆر خراپەو ئازاری زۆرە سەرلێشێوانێک دروست ببێ بۆ بەڕێوبەرەکە یان بۆ ئەو کەسەی فریاگوزاریەکە ئەنجام دەدات بەڵام ئەوەی گرنگە پێویستە بە تەواوی جەستەی بپشکنرێت وە هەر کێشەیەک دەستنیشان کرا لەو بەشەدا دەوەستین و دەگەڕێینەوە بۆ پرایمەری سێرڤەی و چارەسەرکردن و بەڕێوەبردنی حاڵەتەکە.**

| | |
|---|---|
| **سەر، گوێ، چاو، لووت، و قورگ** (HEENT) | **لە رێگەی سەیرکردنەوە پشکنین بکە بۆ**<br>( برین یان سوربونەوە لە کەللە سەری نەخۆش، ناتەواویی لە کەللەی سەر،خوێن لە قورگ و دەمی نەخۆش ، نایەکسانیی لە بیلبیلەی چاوەکان یان وەڵامنەدانەوە بۆ رووناکی لە حاڵەتێک کە زەبر بەر سەریی نەخۆشەکە کەوتبێ،لە دەستدانی بینین یان گۆڕانکاریی لە بینین ئەگەر زەبر بەر چاوەکان کەوتبێ، هاتنە دەرەوەی خوێن یان شلە لە لوت یان گوێی نەخۆش کە دەکرێت نیشانەبێت بۆ زیان گەشتن بە شانەکان یانیش شکانی ئێسکەکانی سەر،زیان گەشتن بە ددانەکان کە لەوانەیە نەخۆش خۆی هەست بە ناتەواوی بکات لە جوڵەی شەویلگە، نیشانەکانی سوتانی بۆری هەوا لەوانە سوتانی مووەکانی ناو لوت و ئاوساویی لە دەم و قورگ)<br>**لە رێگەی گوێگرتنەوە پشکنین بکە بۆ**<br>(ستریدۆر کە لەوانەیە نیشانەبێ بۆ گیرانی بۆری هەوا،گەرگلێنگ کە نیشانەیە بۆ بوونی هەوا لە ناو رێرەوی هەوا،یانیش گۆرانکاری لە دەنگی نەخۆش کە دەکرێت نیشانەی زیان گەشتن بێ بە ڤۆکال کۆرد یانیش بۆری هەوا)<br>**لە رێگەی هەستکردنەوە پشکنین بکە بۆ**<br>تێندەرنێس یان جوڵەی نائاسایی لە ئێسکەکانی دەموچاو دەکرێ نیشانەی شکاویی بێر ، شکاویی ددان دەکرێت وا لە نەخۆشەکە بکات بە بێ ئاگایی ددانەکە قوت بداتەوە ،ناتەواوی یا کریپیتەس لە ئێسەکەکانی کەللەی سەرو دەموچاو کە دەکرێت نیشانەی شکاویی بێ |
| **مل** | **لە رێگەی سەیرکردنەوە پشکنین بکە بۆ**<br>(کەمبوونەوەی توانای جوڵاندنی مل یان ئازار لە کاتی جوڵەدا سوربونەوە، خوێنبەربوون یان ئاوساویی هێماتۆما (سوربونەوە/خوێنبەربوون لە ژێر پێست) – ئەمە لەوانەیە لە کۆتاییدا ببێتە هۆی گیرانی بۆری هەوا ، برینەکانی مل کە برینی کراوەن ، هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانی مل (کە لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ tension pneumothorax-pericardial temponade)<br>**هەست بکە بۆ:** |

| | |
|---|---|
| | (بوونی هەوا لە پێست یان شانە نەرمەکاندا – کە ئەگەری هەیە برینداربوونی بۆری هەوا یان نۆمۆتۆراکس بێت ،تێندەرنێس یان شێواوی بەدرێژایی بڕبڕەی پشت – ئەگەر دابنێ بۆ شکاویی) |
| **سنگ** | **لە ڕێگەی سەیرکردنەوە پشکنین بکە و بگەڕێ بەدوای:**<br>(سوربونەوە، شێواوی، برین جووڵەی نایەکسانی لە دیواری سنگ- پەیوەندی بە pneumothoraxیان chest flial هەیە، سووتانی دەوری تەواوی سنگ (circumferential burn) کە ئەگەری هەیە ببێتە هۆی سەختی هەناسەدان<br>**لە ڕێگەی گوێبگرتنەوە پشکنین بکە بۆ:**<br>(دەنگی هەناسەدان کەمبوونەوەی، نایەکسان یان نەبوونی دەنگ، خیزەی سنگ ، (crepitatitiom )<br>**لە ڕێگەی هەستکردنەوە پشکنین بکە بۆ**<br>(تێندەرنێس کەلەوانەیە بە هۆی شکاوی یان pneumothoraxەوە ڕوبدات) |
| **سک** | **لە سکدا لە ڕێگەی سەیرکردنیەوە پشکنین دەکەین بۆ**<br>(هەڵئاوسانی سک واتە دیستێنش، ئەو برینانەی کە دیارنبرینەکانی هەروەها سوربونەوەیان برین ،سوربونەوەی پشت یان سک، کە ڕەنگە ئاماژە بێت بۆ خوێنبەربوونی ناوەوە<br>سووتانی دەوری سک (ڕەنگە ببێتە هۆی کێشەی زۆر لەکاتی هەناسەدان) |
| **حەوز ئەندامی زاوزێ** | (هەمیشە تایبەتمەندی و نهێنی نەخۆش بپارێزە تایبەتمەندی لە کاتی پشکنیندا)<br>**لە ڕێگەی سەیرکردنەوە پشکنین بکەو بگەڕێ بەدوای:**<br>(سوربونەوە/برینی کراوە لە ناوچەی حەوز ،بوونی خوێن لە ئەندامی نێرینە یان کۆم. لەوانەیە نیشانەی دەسدرێژی سێکسی بن،درز یان خوێنبەربوونی زێ – ئەمانە دەتوانن ئاماژە بن بۆ کراوەی حەوز یان شکان، برینداربوونی منداڵدان، یان لەوانەیە سەرچاوەی لەدەسدانی برێک لە خوێن بوبێ و ئەگەری ئەوەی هەبێ کەسەکە دەسدرێژی سێکسی کرابێتە سەر) برین لە ئەندامی نێرینە<br>پرایپیزم (ڕەپبوونی درێژخایەنی ئەندامی نێرینە) دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ برینداربوونی بڕبڕەی پشت<br>گۆڕانی ڕەنگی میز (ڕەنگی میز زۆر تۆخ یان خوێنی دیار) کە لەوانەیە ئاماژەیە بۆ تێکچوونی ماسولکەکان یان برینداربوونی گورچیلە.<br>**پشکنین بکەوهەست بکە بۆ:**<br>تێندەرنێس یان جوڵەی نائاسایی لە حەوزدا. |
| **پەلەکان** | **پشکنین بکە ڕێگەی سەیرکرنەوە بگەڕێ بە بەدوای:**<br>(ئاوسایی یان سوربونەوە شێواوی، کە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ شکان،شکانی کراوە،برینی بەشەکانی جەستە،سووتانی بەشەکانی جەستە ،پێستی کاڵ کە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ سنووردار بوونی ڕۆیشتنی خوێن.<br>**پشکنین بکەو هەست بکە بۆ:**<br>(نەبوونی یان لاوازی پەستانی خوێن،پێستی سارد کە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ سنووردار بوونی ڕۆیشتنی خوێن) |
| **بڕبڕەی پشت/پشت** | **بە یارمەتی کەسەکە ڕۆڵ بکە، پاشان بگەڕێ بەدوای:**<br>(سوربونەوە،شێواوی) |

| | |
|---|---|
| | **لە ڕێگەی هەستکردنەوە پشکنین بکە بۆ:**<br>(Tenderness,crepitus) و ڕێکخستن بە درێژایی تەواوی بڕبڕەی پشت (سەرەوە مل تا خوارەوەی پشت) ، یان کێشە هەر شوێنێکی تر لەگەڵ بەڵگەی بینراوی زەبر |
| **پێست** | **بگەڕێ یان سەیربکە بۆ:**<br>(سوربونەوە،بڕین،کەمبونەوە ٠هەست بە پەستانی دەوروبەری بکە لە هەر چوار پەلەکاندا،سووتاوی)<br>بەدوای سووتاوی دەوریدا(circumferential burn)بگەڕێ بەپێی شوێنەکە، ئەمانە دەتوانن ببنە هۆی کێشەی هەناسەدان (ئەگەر لەسەر سنگ بێت) یان compartment syndrome |
| **پشکنینی دەمار** | کەمبوونەوەی ئاستی هۆشیاری (بە بەکارهێنانی AVPU یان GCS) و گەشکە کە لەوانەیە نیشانەکانی برینداربوونی سەخت بێت لە سەری نەخۆش، جوڵە و هێز لە هەر ئەندامێکدا، هەستکردن بە دەم و چاو، سنگ، سک، ئەندامەکان،ئەگەر کەمیی هەستیاری هەبێت، دەستنیشان بکە کە لە کوێوە دەست پێدەکات<br>• پرایپیزم (بەردەوامی ڕەقبوونی ئەندامی نێرینە) کەمبوونەوەی هەستکردن، کەمبوونەوەی هێز یان پرایپیزم دەتوانێت ئاماژە بێت برینداربوونی بڕبڕەی پشت |

## IMPORTANT CONDITIONS TO RECOGNIZE AND MANAGE

## BASED ON HISTORY AND SECONDARY SURVEY

| باروودۆخ | نیشانەکانی | وەسف و بەڕێوەبردنی قووڵ |
|---|---|---|
| Head injury | سەرئێشە،گۆڕانکاری لە باری هۆش و ئاگایی، بیلبیلەی چاوی نائاساییە نەخۆش ،برین لە(سەر یانیش شکاوی سەر)، سوربونەوە لە بەشەکانی سەر بەتایبەتتر دەوری چاوەکان و گوێ، هاتنە دەرەوە خوێن یان شلە لە لوت یان گوێ ،بێهێزی لە لایەکی جەستە،گەشکە،گۆڕانکاری لە بینین،لەدەسدانی بیرەوەری ، ڕشانەوە. | چونکە مێشک لە کەللەسەرێکی ڕەقدا داپۆشراوە هەر هەڵئاوسان و خوێنبەربوونێک دروست ببێت برینەکە بە خێرایی دەبێتە مەترسی لەسەر ژیان.<br>چاودێری باری هۆش و ئاگایی نەخۆش بکە.<br>ئەو نەخۆشانەی ناجوڵێن پێویستە هەمیشە چاودێری بکەیت بۆ هەر ڕشانەوەیەک چونکە لەوانەگە ببێتە هۆی خنکان. ئەگەر گومان لە هەر شکاویەک لە کەللەی سەر هەبوو برینەکە کراوەبوو دەرمانی دژە بەکتریای پێ بدە.<br>ڕێژەی گلوکۆز بپێوە ئەگەر هات و کەمبوو یان ئامێرت لانەبوو پێوانەی بکەیت گلوکۆزی پێ بدە.<br>ئەو نەخۆشانەی گلاسکۆ کۆما سکیلەکەیان لە نۆ کەمترە پێوستە سی تی سکانیان بۆ ئەنجام بدرێت لە ماوەی دوو کاتژمێری دوای ڕووداوەکە ئەگەر توانرا. |
| Facial fracture | شێواندن یان جوڵەی نائاسایی لە ئێسکی دەموچاو نەخۆش ڕاپۆرت دەدات شەویلگەکە بە شێوەیەکی ئاسایی دادەخرێت یان نا ، ددانەکان ڕێکن یاننا، هەروەها کێشەی | ئەگەر شکاویەکە لە ڕوخساربوو برینی کراوەی دروست کردبوو پێویستە دەرمانی دژە بەکتریا وەربگرێت.<br>ڤاکسینی تیتانیەس دوبارە بکرێتەوە.<br>گومانی ئەوە دابنێ کە زەبر بەر بڕبڕەکانی پشت و مل کەوتبێ بۆیە نابێ |

| | | |
|---|---|---|
| | جوڵەی چاو. | جوڵەی پێ بکرێت و پێویستە جێگیر بێت<br>پۆزیشنی نەخۆش رێک بخە بۆ رێگری لە گیرانی بۆری هەوا.<br>دوربکەوە لە دانانی ( nasopharyngeal airway and nasogastric tube)ئەگەر گومانی شکاوی هەبو لە روخسار. |
| Penetrating eye injury | هەر تەنێک یان شتێکی نامۆ بینرا لە چاوی نەخۆش،<br>ئازاری چاو ، سوربونەوە، راپۆرتکردن لە لایەن نەخۆشەوە بەوەی هەست بەوە دەکات شتێک لە ناو چاویەتی چونکە هەندێک جار زۆر بچوکەو ئێمە ناتوانین بە چاوی ئاسایی بیبینین،کێشەی بینین،بیلبیلەکانی نائاسایین کەسەکە ،ئەگەر بیلبیلەکانی نائاسایی بون و شلە لە چاوی دەهات نیشانەی ئەوەیە برین لە چاوی هەیە،<br>هەر بەڵگەیەکی بونی زەبر هەبوو لە روخسا. | هەوڵ مەدە پەستان لەسەر چاوەکانی دروست بکەی چونکە تەنیا حاڵی نەخۆشەکە خراپتر دەکەیت<br>ئەگەر هەر تەنێکی نامۆ چوبوە ناو چاوی نەخۆش هەوڵ مەدە دەری بهێنی،دەرمانی دژە بەکتریای پێ بدە، ڤاکسینی تیتانیەس نوێ بکەرەوە ئەگەر پێویست بوو،با سەری نەخۆشەکە بەرز بێت وە دوربکەوە لە پەستان خستنە سەر چاو، بەپەلە کار بۆ گواستنەوەی نەخۆش بکە. |
| Penetrating neck wound | لەوانەیە برینێکی بچوک لە ملیدا نیشانەی زیانێکی ناوەکی گەورە بێت.<br>ئاوساویی کە نیشانەی کۆبونەوەی خوێنە (هیمەتۆما) بە وردی سەیری بکە<br>ئەگەرهاتوو هەر تەنێک لە ناوەوە بە جێمابوو. | ئەو نەخۆشانەی برین لە ملیاندا دروستبو دەکرێت توشی گیرانی بۆری هەوا ببن بۆیە ئەوەی لەسەر تۆ پێویستە ئەوەیە بە وردی چاودێری رێرەوی هەناسە بکەیت. نابێ بڕبڕەکانی زۆر جوڵەیان پێ بکرێت پێویستە نەخۆشەکە جێگیر بێت بەڵام لە حاڵەتێک هەر شتێک ملی بڕیبوو لە ناوی مابۆوە نابێ هەوڵ بدرێت دەربهێنرێت (خوێن بەربون زیاتر دەکات) پەستانێکی کەم و نەرم بکە لە حاڵەتی خوێن بەربون ،نابێت بە پەستانێکی زۆربێت دەبێتە هۆی گیرانی بۆری هەوا. |
| Chest injury | ڤورسیی لە هەناسەدان،لە کاتی پاڵپێتەیشندا کریپیتا یان تێندەرنێس دەبێت شوێنەکە،قەفەزەی سنگ بە تەواوی ناکشێت لە ماوەی هەناسەدان یانیش دەنگی هەناسەدانی نائاساییە. | بە وردی چاودێری هەناسەدانی نەخۆش بکە بۆ هەر کێشەیەک لە ئەنجامی زیان کەوتن بێ لە سییەکان کە لەوانەیە بە تێپەربونی کات دروست ببێت.<br>تێنشن نیومۆثۆراکس پێویستە لە پرایمەری سێرڤەی چارەسەر بکرێت.<br>لەوانەیە زیان کەوتن بە سیەکان لە ئەنجامی سمپڵ نیومۆثۆراکس بێ بە تێپەربونی کات ببێتە هیمۆثۆراکس<br>هەر نەخۆشێک هیمۆثۆراکس بوو بە وردی چاودێری بکەو ئۆکسجینی پێ بدە.<br>کریپیتەس یان تێندەرنێس لەوانەیە لە ئەنجامی شکانی پەراسوەکان دروست بێ ، کە ئەمەش لە ئەنجامی زیان گەشتن بێت بە سنگ یان سک.<br>ڕاستەوخۆ ژار بۆ گواستنەوەی نەخۆش بکە . |
| Abdominal injury | ئازاری سک<br>Tender, firm or distended abdomen on examination<br>ماسولکەکانی سکی جوڵەی لە پریان هەیە دەنگی ریخۆڵە(باوڵ ساوند )نامێنێ یانیش زۆر کەم دەبێتەوە.<br>خوێن بەربونی کۆم،بوونی برین لە سک، سوربونەوە لە دەوری ناوک یان کەلەکەی نەخۆش کە دەکرێت نیشانەی خوێن | ئازاری زۆر لە سک دەکرێت نیشانەبێت بۆ زیان گەشتن بە ئەندامەکانی ناوەوە یانیش خوێن بەربونی ناوەکی.<br>ئەگەر گومان هەبوو زیان بەر ئەندامەکانی سکی کەوتبێ شلەی لە رێگەی ئایڤی پێ دەدەین،نابێ لە رێگەی دەمەوە هیچ بخوات یان بخواتەوە،<br>لەحاڵەتێک ئەگەر هاتو ریخۆڵەی نەخۆشەکە هاتبۆوە دەرەوە پێویستە : هەوڵ مەدە بیخەیتەوە ناوەوەی سکی لە دەرەوەی سکی بەجێی بهێڵە، ئەگەر بەردەست بوو گۆزی تحقیم کراو هەڵکێشە لە نۆرماڵ سەلاین و ریخۆڵەکەی پێ داپۆشە.<br>دەرمانی دژە بەکتریای پێ بدە، |

| | | |
|---|---|---|
| | بەربونی ناوەکی بێت. | ئەگەر هەر گومانێک هەبوو بۆ پێگەشتنە زەبر بە ئەندامەکان و سک کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی  بکە بۆ نزیکترین نەخۆشخانە . |
| Spinal cord injury | نیشانەکانی بڕیتین لە (ئازاری دڕکە پەتک و بڕبڕەی پشت، نەخۆشەکە هەست بە ئازار دەکات ئەوکاتەی دەست لەسەر شوێنەکە دادەنێیت(tenderness)،کێشە لە کاتی جوڵەکردن وەک شەلەل بوون، وەڵامدانەوەی نائاسایی ،بێ هێزی کێشەی هەستەوەرەکان Tingling pins and needles sensation لەدەستدانی هەستکردن.لەدەستدانی کۆنترۆڵکردنی میز و پیسایی Priaspismلەوانەیە نەخۆشەکە پەستانی خوێنی دابەزێت وە لێدانی دڵی زیاد بکات Crepitus when you touch the spinal cord Spinal bones that are not properly aligned کێشەی هەناسەدانی بۆ دروست دەبێت ئەگەر هاتو زیان بە سێرڤایکاڵ سپاین گەشتبێ | پێویست دەکات بڕبڕەکانی کەسەکە جوڵەیان پێ نەکرێت ئەوکاتەی کەسەکە بێ هۆشە و گومانی ئەوە هەیە زەبر بەر بڕبڕەکانی کەوتبێت، یانیش نەخۆشەکە هۆشی هەیە بەڵام ئازاری سەرو ملی هەیەو هەست بە لاوازی و بێهێزی و سڕبون دەکات. (neck collar)(rolled sheet) بەکاربهێنە بۆ ڕێگری کردن لە جوڵەی بڕبڕەکانی مل کاتێک کاتێک نەخۆشەکە دەگوازیتەوە یانیش پشکنینی بۆ ئەنجام دەدەیت ئای ڤی فلودی پێ دەدرێت، هەروەها ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی دەکەین بە یەکەیەکی پێشکەوتوی چارەسەر. |
| Internal bleeding (not seen on primary survey) | سوربونەوەی دەوری ناوک یان بە درێژایی کەلەکە (flanks)ی کەسەکە لەوانەیە نیشانەی خوێن بەربونی ناوەکی بێ. شکانی ئێسکی حەوز، femur fractures، کەمبونەوەی دەنگی هەناسە لە لایەکی سیەکانی نەخۆش (hemothorax)، نیشانەکانی کەمی پێرفیوژن(دابەزینی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، سپی هەڵگەرانی پێست و ئارەقکردنەوەی نائاسایی. | دەکرێت ڕێژەیەکی زۆر لە خوێن لەدەست بچێت ئەگەر هاتوو خوێن بەربونەکە لە ناوچەکانی سنگ ، حەوز، ڕان ، وە خوێن بەربونەکە ناوچەی سک بگرێتەوە پێش ناسینەوەو دیاریکردنی. ئەگەر توانرا کۆنترۆڵی خوێن بەربونەکە بکە -bind pelvis or splint femur ئای ڤی فلودی پێ بدە. ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ ڕادەستکردنەوەی نەخۆش بکە بە یەکەیەکی پێشکەوتو کە توانای گواستنەوەی خوێنیان هەبێت. |
| Pelvic fracture | نەخۆشەکە ئازاری دەبێت لا ماوەی ئەنجامدانی پاڵپێتەیشن بۆ ناوچەی حەوز، جوڵەی نائاسایی یان نەتوانینی جوڵەکردن بە ئێسکی حەوز، خوێن بەربون لە کونە کراوەکانی ناوچەی حەوز (نم: کۆم). | ئای ڤی فلود و ئازارشکێنی پێویستە پێ بدرێت پەستام خستنە سەر حەوز بە هێواشی بۆ دڵنیابوون لە جێگیربوونی ،نابێ زوو زوو پشکنینی بۆ بکەین و دووبارەی بکەینەوە چونکە ئەمە دەتوانێت خوێنبەربونی ناوەکی خراپتر بکات. بە(Sheet ,pelvic binder) ناوچەی حەوز جێگیر بکە بە بەکارهێنانی ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بۆ یەکەیەک توانای گواستنەوەی خوێنی هەبێت. |
| Extremity fracture with poor perfusion | (Deformity)یان(crepitus) لە ئێسکەکاندا،نەمانی پەڵس لە ژێر شکاویەکەدا،کاپیلەری ریفیلی زیاتر بێ لە | شکاوی لەوانەیە شوێنی ڤێنەکە لە شوێنە ڕاستەکەی خۆی لابدات و ڕێژەی گەشتنی خوێن بە ناوچە شکاویەکە بگۆرێت و کەمی بکاتەوە، پێویستە چێکی پەڵسی بکەیت، وە کاپیلەری ریفیلی بە هەمان شێوە،ئەگەر |

| | | |
|---|---|---|
| | سێ چرکە لە خوارەوەی شکاویەکە،ساردبونەوەی پەلەکان لەو شوێنەی شکاویەکەی تێدایەو و شین ، رەساسیبوونی رەنگی پێستەکە. | شکاویەکەت دیاریکرد لە رێگەی بیهێزی پەڵس یانیش کەمی پێرفویژنەوە لە ناوچەکە(re-establish perfusion)<br>دووبارە پێرفوژن رێک بخەرەوە لە رێگەی (Reduction)کە بریتیە لە رێکسختنەوەی شوێنی ئێسکەکە بۆ شوێنی پێشوتر و گونجاوی خۆی ، وە (Splint)کردنی شکاوی. هەمیشە پێش و پاش (reduction)ەکە پێویستە چێکی پەڵس و کاپیلەری ریفیل بکەیتەوە لە شوێنەکە.<br>راستەوخۆ پلان بۆ گواستنەوە/ رادەستکردنەوەی نەخۆشەکە بکە بۆ یەکەی پێشکەوتوی چارەسەر. |
| Open fracture | (Deformity)یان(crepitus) تێبیدا دەردەکەوێت. | گومانی ئەوە دابنێ کە کەسەکە (Open fracture)هەبێت ئەگەر هاتو برینی هەبوو کە زیاتر بێ لە روشاویی، کە ئەن حاڵەتەش حاڵەتێکی بە پەلەیە چونکە دەکرێت سەربکێشێت بۆ هەوکردنی توندی ئێسک کۆنترۆڵکردنی خوێن بەربونەکە لە رێگەی پەستانی راستەوخۆ (Direct pressure).<br>(reduction)ئەگەر هات و نیشانەکانی کەمی پێرفویژن هەبوون.<br>پاککردنەوەی برینەکەو پێچانی، ئەگەو پێیوستی کرد دژە بەکتریاو ڤاکسینی تیتانیەس پێویستە بدرێن،(Splint )کردنی شکاوی<br>راستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ رادەستکردنەوەی بە پەلەی نەخۆشەکە بکە. |
| Open wound | (Laceration)،(Abrasion )،ئەو برینانەی بە ئاسانی لەوانەیە تێبینی نەکرێن و ون بین ئەمانەن<br>Wounds in the underarm area, genital area, buttocks or back<br>ئەگەر خوێن بەربونەکەی زۆر بە تەوژم و زۆربوو ئەگەری هەیە خوێن بەربونەکە لە ئارتەری بێت. | ئامانج لە (wound care) بریتیە لەوەی رێگری بکەین لە توشبون بە هەوکردن و درەنگ چاکبونەوەی، هەروەها بۆ ئەوەیە هەڵسەنگاندن بۆ بەشەکانی ناوەوە بکەین و پاڵپشتیان بکەین و یارمەتی خێرا چاکبونەوەی برینەکە بدەین.<br>خوێن بەربونەکە کۆنترۆڵ بکەو بوەستێنە،<br>پاککردنەوەی برینەکە بە ئاو سابون یان هەر جۆرە (antiseptic) یکی دیکە بۆ پاککردنەوە لابردنی هەموو جۆرە پیسیەک لە سەر برینەکە کە ئەگەری هەوکردن زیاد دەکات ( ئەگەر بەردەست بوو دەتوانیت لۆکاڵ ئەنەسیزیا بدەیت لە شوێنەکە بۆ ئەوەی لەکاتی پاکردنەوەکەی زۆر ئازاری نەبێت نەخۆشەکە )<br>برینەکە بە گۆزی تەحقیمکراو دریس بکە ئەگەر بەردەست بوو.<br>(capillary refill)چێک بکەرەوە پێش و پاش دریس کردن.<br>(Splint extremities)بەکاربهێنە بۆ پەلەکان ئەگەر ( large lacerations) زۆربوو بۆ ئەوەی یارمەتی زوو چاکبونەوەی برینەکە بدەیت وە ئازاری کەمتری هەبێت بۆ نەخۆشەکە.<br>ئەو شوێنەی برینەکەی لێیە جێگیربکە وە ئەگەر هەر شتێک چوبوە ناو پێستەکە هەوڵ مەیە دەربیهێنی تەنیا جێگیری بکە.<br>ئەگەر پێوەدانی ماربوو هەوڵبدە جوڵە بە شوێنەکە یان بە پەلەکە نەکەیت.<br>بۆ پێوەدانی ئاژەڵ پێویستە راوێژ بە دابینکەری پێشکەوتوو بکەیت چونکە ئەگەری توشبونی بە هەوکردن ، نەخۆشی هاریی هەیە.<br>Depending on vaccination status, management can be extremely time-sensitive.<br>ئەگەر پێویست بوو (tetanus vaccination) دەدرێت. |

| Management by injury mechanism | | |
|---|---|---|
| **بەڕێوەبردن** | **نیشانە** | **باروودۆخ** |
| برینەکانی(crush injury) دەتوانێت ئاڵۆزی جددی هەبێت. بەدوای نیشانەکانی (compartment syndrome)بگەڕێ (کۆبوونەوەی فشار لەناو ماسولکەکاندا کە دەتوانێت خوێن بۆ ماسولکە و دەمارەکان سنووردار بکات) و تێکچوونی گورچیلە.<br>گرنگە چاودێری دەرچوونی میز بکرێت و بەدوای میزی قاوەیی سووردا بگەڕێت (نیگەرانییەکە بۆ ئەگەری تێکچوونی گورچیلە) پێدانی شلەی IVبۆ یارمەتیدانی گورچیلە بۆ پاراستنی دەرچوونی میز.<br>شکانی سپلینت بۆ ئەوەی کۆتایی ئێسکەکان زیانی زیاتریان پێ نەگات. پلان دابنێ بۆ ڕەوانەکردنی پێشوەختەی نەشتەرگەری ئەگەر نیشانەکانی کۆمپارتمەنت وردە وردە دەست بە دروستبوون و گەشەکردن بکات.<br>لەوانەیە نەخۆشەکان کێشەی سیستەمی زۆریان هەبێت کە پەیوەندییان بە تێکچوونی ماسولکەکانەوە هەبێت و پێویستە هەمیشە ڕادەستی دابینکەرێکی پێشکەوتوو بکرێن | شکان، bruising، تێکچوونی شانە نەرمەکان و بەڵگەی compartment syndrome و ئازار، firm muscle compartments، سڕبوون، کەمبوونەوەی پەلس یان پێستی کاڵ( بڕێکی کەم میزی سوور و قاوەیی). | **Crush injury** |
| تەقینەوە دەتوانێت ببێتە هۆی برینداربوون بە سێ شێوە:<br>برینداربوونی دیار (پارچە کانزایەک کە لەلایەن ئامێری تەقەمەنییەوە دەردەچێت) یان سووتانی گەرمی یان ماددە کیمیاییە دەرچووەکان.<br>برینداربوونی ناوەوە (زۆرجار شاراوە) بەهۆی گۆڕانی پەستانەوە کە بەهۆی تەقینەوەکە دروست دەبێت. گەدە و ڕیخۆڵە، سییەکان و گوێچکە بە شێوەیەکی باو بریندار دەبن؛ و<br>برینی بێدەنگی زیادە کە لە ئەنجامدا کاتێک جەستە بەهۆی تەقینەوەکە فڕێ دەدرێت. بە وردی پشکنین بۆ سییەکان.<br>ئەگەر کێشەی هەناسەدان هەبوو ئۆکسجین بدە نوێکردنەوەی(tetanus vaccination).<br>پێویستە سووتاوییەکان جل و بەرگیان لەبەر بکرێت و پێویستی شلە حیساب بکرێت بە پشتبەستن بە ناوچەی سووتاوی ئەگەر نەخۆشەکە ئازاری سکی هەبوو، بیر لە کونکردنی ڕیخۆڵە بکەرەوە، شلەی IV بدە.ئامادەکاری بۆ ڕەوانەکردنی خێرا بۆ نەشتەرگەری. | برینداربوونی ئەندامەکانی پڕ لە هەوا (وەک سییەکان، گەدە و ڕیخۆڵە · (دواکەوتنی نیشانەکانی زیادبوونی هەناسەدان، کەمی ئۆکسجین، ئازاری سنگ، کۆکە بە خوێن یان بەبێ خوێن · ئازاری سک، سکچوون، ڕشانەوە بە خوێن یان بەبێ بوونی خوێن پچڕانی پەردەی گوێچکە (تەپڵی گوێ): لەدەستدانی بیستن، زەنگ لێدان لە گوێچکەکاندا، ئازار، خوێنبەربوونی گوێ و برینداربوونی تر، سووتان، بەرکەوتن بە ماددەی کیمیایی یان ژەهر. | **Blast injury** |
| سووتاوی کاریگەری لەسەر هەموو جەستە دەبێت و ببێتە هۆی برینداربوونی شانە نەرمەکان و ئاوسانی و شۆک کە لە ئەنجامی لەدەستدانی شلە بەهۆی سووتانەوە دروست دەبێت. ئامانج لە بەڕێوەبردنی سووتان بریتییە لە وەستاندنی پرۆسەی سووتان و چاودێریکردنی ئاوسان و قەرەبووکردنەوەی لەدەستدانی شلە. لە برینداربوونی بەرچاوی سووتاویدا شلە دزە دەکاتە ناو پێست و شانەکانی دەوروبەری و دەبێتە هۆی ئاوسانی و شۆک.<br>سووتانی بۆری هەوا دەتوانێت بەخێرایی ببێتە هۆی گیرانی بۆری هەوا. | ڕەنگی پێست دەتوانێت لە پەمەیی، سوور، کاڵ، یان ڕەشەوە بێت، ئەمەش بەپێی قووڵی سووتاوییەکە. لەوانەیە سووتاوییەکە بڵق ئاویی هەیە یان نا ئەمانەی خوارەوە لەوانەیە پێشنیاری هەناسەدان یان برینداربوونی بۆری هەوا بکەن. گۆڕانی ڕەنگ بۆ خۆڵەمێشی لە دەوروبەری دەم و لوت، یان مووی لووت (singedسووتاو و ئاوسانی لێو یان دەم و دەنگ دەگۆڕێت. | Burn injury |

**جێگرتنەوەی لەدەستدانی شلە و پێشبینیکردنی لەدەستدانی بەردەوام زۆر گرنگە.**

**بۆ حیسابی پێویستی شلەیIV ، گرنگە قووڵی سووتانەکە و ڕێژەی سەدی ڕووبەری جەستە (BSA) دیاری بکرێت کە سووتاون.**

**لەبیرت نەچێت کوتانی (tetanus) و کەمکردنەوەی ئازار بۆ برینەکانی سووتاوی بدەیت.**

**هەموو خشڵ و زێرەکان لابەرە و ئەگەر دەکرێت ئەو ئەندامەی کە سووتاوە بەرز بکەرەوە.**

**سووتاوی مەترسی زۆرە بۆ تووشبوون بە هەوکردن، تەنانەت بە چاودێرییەکی باشیش. پاککردنەوە و پۆشینی برینەکە بە وریاییەوە گرنگە**

**ئەو سووتاویانەی کە پێویستیان بە ڕادەستکردنی خێرا/گواستنەوە هەیە:**

**سووتانی سەخت بۆ >15%ی جەستە**

**سووتانی دەست، دەموچاو، ناوچەی بڕبڕەی پشت، جومگەکان، یان سووتانی دەوری ڕێڕەوی هەناسە**

**سووتانی لەگەڵ زەبری تری پەیوەندیدار**

**هەر جۆرە سوتانێک لە کەسانی زۆر منداڵ یان بەساڵاچوودا بوونی نەخۆشی بەرچاو پێش سووتانی (وەک شەکرە).**

# SPECIAL POPULATIONS

زەبر لە کاتی دووگیانیدا(TRAUMA IN PREGNANCY)

هەر نەخۆشێکی مێینە لە تەمەنی ١٠-٥٠ ساڵدا پێویستە پشکنینی دووگیانی بۆ بکرێت. دووگیانی دەبێتە هۆی گۆڕانکاری زۆر لە فیزیۆلۆژیا وپێویستی بە ڕەچاوکردنی زیاتر هەیە بۆ باشبوون و پاراستنی کۆرپەلە. تەنانەت زەبری بچووکیش لەوانەیە زیان بە دایک و کۆرپەلە بگەیەنێت. ئەو ژنانەی لە سێ مانگی سێیەمدا تووشی زەبر دەبن، مەترسی تووشبوونیان هەیە بە پچڕانی منداڵدان واتە placental abruption لە ئەنجامدا خوێنبەربوون،منداڵبوونی پێشوەختە روبات.

لەبیرت بێت زیندووکردنەوەی دایکەکە کۆرپەلە زیندوو دەکاتەوە.

KEY ELEMENTS OF PATIENT HISTORY

- تەمەنی دووگیانی (تەمەنی کۆرپەلە یان ژمارەی هەفتەکانی دوایین سوڕی مانگانە).
- ئاڵۆزیەکانی دووگیانی.

PRIMARY SURVEY

- AIRWAY: ئاوسان لە کاتی دووگیانیدا دەبێتە هۆی گیرانی بۆری هەوا بۆیە بە وردی چاودێری بکە.
- BREATHING: ناوپەنچک لەلایەن منداڵدانی دووگیانەوە پاڵدەنرێت بۆ سەرەوە، ئەمەش شوێنی کەمتری سییەکان بۆ هەناسەدان دەمێنێتەوە
- CIRCULATION: پشکنین بۆ خوێنبەربوونی زێ بکە هەروەها منداڵدانی دووگیان دەتوانێت خوێنبەرە گەورەکان پاڵپێوە بنێت و ببێتە هۆی دابەزینی فشاری خوێن، هەر بۆیە ڕێوشوێنی خۆپارێزی بڕبڕەی پشتی و ملی لەبەرچاوبگرە و نەخۆشەکە لە لای چەپ دابنێ.
- DISABLITY: هەمیشە بیر لە ئیکلەمپسیا بکەرەوە ئەگەر گەشکە ڕوویدا.
- EXPOSURE:نەخۆشەکە گەرم بهێڵەوە و مەهێڵە پلەی گەرمی دابەزێت.

COMMON CONDITIONS CAUSED BY TRAUMA

- منداڵبوونی پێشوەختە (زوو) لەگەڵ یاخود بەبێ پچڕانی پێشوەختەی پەردەکان (لەدەستدانی شلەی دەوروبەری کۆرپەکە).
- پچڕانی منداڵدان: دەبێتە هۆی لەدەستدانی خوێن و ئەگەری هەیە ببێتە هۆی شۆک.
- گەشکە

SPECIAL MANAGEMENT CONSIDERATIONS

- زوو پلان دابنێ بۆ ڕادەستکردن/گواستنەوە بۆ یەکەی پسپۆڕی چاودێری منداڵبوون.
- ئەگەر هەست بە منداڵدان بکرێت لە ئاستی ناوک ئەمە بە گشتی ئاماژەیە بۆ ئەوەی نەخۆشەکە لانیکەم ٢٠ هەفتەی دووگیانە.
- ئەگەر ئافرەتەکە دووگیانی زیاتر بوو لە ٢٠ هەفتە (٥ مانگ) ئەوا منداڵدانی دووگیان دەکرێت Vena cava خوارەوە پاڵە پەستۆ بکات و پەستان دروست ببێ وەک دەزانین ڤێنەکاڤا ئەو بۆرییە گەورەیەیە کە خوێن دەهێنێتەوە بۆ دڵی و دەکرێ ببێتە هۆی شۆک. لەکاتی پاڵکەوتنی نەخۆشە دووگیانەکە بە تەختی، هەمیشە لەسەر لای چەپ (لە سەر تەختەی بڕبڕەی پشت ئەگەر پێویست بوو جوڵەی پێ نەکرێت و جێگیر بێت)
- زەبر لە کۆتاییەکانی دووگیانیدا لەوانەیە ببێتە هۆی منداڵبوونی پێشوەختە . ئامادەکاری بکە بۆ (neonatal resustation)ی تازەلەدایکبووان ئەوکاتەی کە زەبر لە کۆتاییەکانی دوگیانیدا ڕوودەدات

SPECIAL CONSIDERATIONS IN CHILDREN

منداڵان دەتوانن دوای بریندداربوون بە باشی دەربکەون، لەگەڵ ئەوەشدا بە خێرایی تێکبچن ،شێوازی بریندداربوونیان جیاوازە، و بریندداربوونی سەختی ئەندامەکانی ناوەوە لەوانەیە بەبێ شکانی کەللەسەر یان بڕبڕەی پشت ڕووبدات (ئێسکەکانی منداڵان نەرمترن). کێشە باوەکانی بەڕێوەبردن بریتین لە ( over or under resuscitation)، هەڵەی دەرمان و نەناسینی دابەزینی گەرمی و دابەزینی شەکری خوێن.

لە خوارەوە ڕەچاوکردنی تایبەت بۆ منداڵانی برینددار دەخەینەڕوو

- (Airway)کاتێک گومانی بریندداربوونی مل یان بڕبڕەی پشت و مل دەکرێت، پاڵنانی چەناگە بەکاربهێنە بۆ کردنەوەی بۆری هەوا بە دەست لەکاتێکدا بێ جووڵەی بڕبڕەی پشت و ملی دەپارێزیت. منداڵان سەری گەورە و زمانیان گەورەیە کە ڕەنگە بە ئاسانی ڕێڕەوی هەناسەیان بگرێت. منداڵان و کۆرپەی بچووک لەوانەیە پێویستیان بە پادێک لە ژێر شانەکاندا هەبێت بۆ ڕێکخستنی بۆری هەوا.( بڕوانە لێهاتوویەکان)



Neutral position in infants Head-tilt and chin-lift in children (no trauma)

- (breathing)ئەگەر منداڵەکە دوای کردنەوەی بۆری هەوا بە شێوەیەکی گونجاو هەناسە نەدا، یارمەتی هەناسەدان بدە لە ڕێگەی(bag-valve-mask ventilation)، بە باشترین شێوە بە ئۆکسجین. پێدانی هەناسەیەک لە هەر ٤ چرکەیەکدا (١٥ هەناسە لە خولەکێکدا) بۆ منداڵانی گەورەتر و هەر ٣ چرکەیەک هەناسەیەک (٢٠ هەناسە لە خولەکێکدا) بۆ کۆرپە.
- (Circulation)بۆ لەدەستدانی بەردەوامی خوێن یان بەڵگەی خراپی پەرفیوژن لە منداڵانی تووشبوو بە دۆخی خۆراکی ئاسایی (normal nutritional status)شلەی IV بدە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکەرەوە.



بۆ منداڵانی بەدخۆراکی، پێویستە شلەمەنیەکان ڕێکبخرێن. بۆ برینداربوونی توندی سووتاوی، بۆلۆسی سەرەتایی لەگەڵ شلەکانی دیکسترۆزی تێدایە بدە.ئەگەر خوێنبەربوونی بەرچاو ڕوویدا، ڕێکخستن بکە بۆ گواستنەوەی خوێن یان ڕادەستکردنەوە/گواستنەوەی خێرا بۆ ناوەندێک کە توانای گواستنەوەی خوێنی هەبێت.

- (Disability)چاودێری ئاستی هۆشیاری منداڵ بکە بە پێوەری AVPU (ئاگادار، وەڵامدەرەوە بۆ هاندەرە زارەکییەکان، وەڵامدەرەوە بۆ هاندەرە ئازاربەخشەکان، وەڵامنەدەرەوە)
- هەڵسەنگاندن بۆ sizure/convulsion و بەڕێوەبردنیان.
- هەڵسەنگاندن بۆ دابەزینی شەکری خوێن و بەڕێوەبردنی.

- (Exposure)هەموو لەش دەربخە بەڵام ئاگاداری کەمبوونەوەی پلەی گەرمی بە .لۆگ-ڕۆڵ بەکاربهێنە بۆ هەڵسەنگاندنی پشت و سەری منداڵەکە.

## گشتی

لەوانەیە منداڵانی بچووک کەمتر لە گەورەکان بتوانن ڕووداوەکان ڕاپۆرت بکەن، تەنانەت ڕووداوە گەورەکانی وەک لێدانی ئۆتۆمبێل. هەمیشە ئەگەری زەبری بێ شایەتحاڵ لە منداڵانی بچووکدا لەبەرچاو بگرە

برینداربوونی سەر هۆکارێکی باوی مردنە لە منداڵاندا و منداڵەکان زۆرجار تووشی ئاوسانی توندی مێشک دەبن دوای برینداربوونی سەختی سەر ئەگەر نەخۆشێکی منداڵ نیشانەکانی برینداربوونی مێشکی بە زەبری هەبوو، بەپەلە بیگوازەرەوە بۆ شوێنێک کە چاودێری گرینگ و/یان توانای نەشتەرگەری هەبێت

برینداربوونی سنگ: برینداربوونی سنگ دەتوانێت مەترسی لەسەر ژیان دروست بکات و منداڵان پێویستیان بە هێزی کەمتر هەیە بۆ برینی ناوەوە بە سەختی. لەوانەیە برینێکی بەرفراوانی سنگ هەبێت بەبێ شکانی بڕبڕەی پشت.

برینداربوونی سک: سکی منداڵان تاڕادەیەک گەورەترە لە گەورەکان و سکیش شوێنێکی باوی برینداربوونە لە منداڵاندا. بە تایبەتی برینداربوونی سپڵ و جگەر زۆرە. پێویستە لە هەموو نەخۆشانی زەبر لە منداڵاندا برینەکانی سک لەبەرچاو بگیرێن چونکە دەتوانێت مەترسی لەسەر ژیان دروست بکات و ببێتە هۆی خوێنبەربوونی توندی ناوەوە.

برینداربوون بەهۆی سووتاوی: سووتاوی منداڵان دەتوانێت بەڕێوەبردنی قورس بێت. پێویستیان بە زیندووکردنەوەی شلەی ورد (resustation fluid) و چاودێری ورد هەیە بۆ ئاوسانی بۆری هەوا و دەرمانی ئازارشکێن و گۆڕینی پۆشاک. لە منداڵانی سووتاودا، پلان دابنێ بۆ ڕادەستکردنی خێرا/گواستنەوە بۆ یەکەیەکی سووتاوی.

# DISPOSITION CONSIDERATIONS

**نەخۆشانی زەبر دەکرێت برینێکی ئاڵۆزیان هەبێت کە ڕەنگە شاراوە بن، و دەتوانن زۆر بە خێرایی خراپتر بن و بمرن. هەمیشە نەخۆشە سەختە بریندارەکان ڕەوانەی ئاستێکی بەرزتری چاودێری بکەن بۆ چارەسەری تایبەتمەند.**

**ئەم بارودۆخە مەترسیدارانەی خوارەوە هەمیشە پێویستیان بە ڕادەستکردنەوە/گواستنەوە بۆ یەکەیەکی پسپۆڕ هەیە بۆ چاودێری بەردەوام:**

- **کێشەی بۆری هەوا کە پێویستی بە دەستێوەردان هەیە.**
- **نیشانەکانی شۆک**

(Tension pneumothorax) **کە پێویستی بە** ( needle decompression ) **هەیە,پێویستی بە دانانی** (Chest tube)**هەیە**

(Pericardial tamponade)**دڵنیابە لە پێدانی شلەی** IV **و بەردەوامبوون لە گواستنەوە.**

- **گۆڕانی باری دەروونی (خەواڵوویی، بێهێزی، سەرلێشێواوی یان بێهۆشی).**
- **زەبر لە کاتی دووگیانیدا: لە لای چەپ دابنێ بۆ گواستنەوە (پێویستی بە چاودێری پسپۆڕی منداڵبوون هەیە).**
- **منداڵێک کە کێشەی** ABCDE **ی هەیە، سووتاوە، یان هەر برینێکی سەر، سنگ یان سک.**
- **هەر برینێکی سەختی سووتاوی: قووڵی سووتاوی و کۆی ڕووبەری سووتاوی هەڵسەنگێنە، دەست بە** ( fluid resuscitation)**بکە (باشترە بگوازرێتەوە بۆ یەکەیەکی پسپۆڕی سووتاوی)**

# Disposition consideration

**ئەگەر نەخۆشێک پێویستی بە ئۆکسجین بوو، پێویستە کار بۆ بەردەوامبوونی پێدانی ئۆکسجین بکەیت لەسەری لە کاتی گواستنەوە و دوای ڕادەستکردنەوەش بەردەوام بێت. ئەگەر کەسێکی بریندار نیشانەکانی شۆکی هەبوو ، دڵنیابە کە شلەی** IV **لە کاتی گواستنەوەدا دەستی پێکردووە و بەردەوام دەبێت. دڵنیابە کە هەر خوێنبەربوونێکی دەرەکی لە کاتی گواستنەوەدا کۆنترۆڵ کراوە و چاودێری دەکرێت.**

MULTIPLE CHOICE QUESTIONS

Answer the questions below. Questions and answers will be discussed in the session.

1. Which of the following is a component of the trauma primary survey?

A. Examine the arms for any fractures

B. Check the skin color and temperature

C. Examine the ears for any drainage of blood or clear liquid

D. Check skin pinch

2. You are assessing a man who was in a car crash. He is very confused, but the remainder of his

primary survey is normal. How do you perform a SAMPLE history if the patient is too confused

to answer your questions?

A. You do not need to do a SAMPLE history in a trauma patient

B. Ask the patient repeatedly until he is able to answer

C. Ask bystanders or family member for the information

D. Assume that there is no important information

3. A 23-year-old man is carried in after diving head first into a river. He is speaking and his

airway is open but he cannot walk or move his arms or legs. What is the first thing you must do?

A. Place an IV line

B. Examine him for other injuries

C. Immobilize the cervical spine

D. Give him a tetanus vaccination

4. You are evaluating a 21-year-old male who was in a motorcycle crash. He was thrown from

the motorcycle and suffered injuries to his face, chest and legs. When you compress his pelvis,

he screams in pain. His vital signs are: blood pressure 90/40 mmHg, heart rate 120 bpm,

respiratory rate 25/min. What should be your next step?

A. Place in a pelvic binder

B. Administer tetanus vaccine

C. Provide antibiotics

D. Clean the abrasions with soap and water

5. A young woman has been brought in after an explosion. She has an open airway, a respiratory

rate of 30/min, heart rate 125 bpm, blood pressure of 85/50 mmHg, has moist pale skin and

she complains of abdominal pain. She has small wounds to her skin but there is no obvious

bleeding. What would you do to manage this patient?

A. Place two large-bore cannulae and give 1 litre of fluid

B. Offer her a drink of water

C. Check her temperature

D. Provide antibiotics

# Chapter 3: Approach to difficulty in breathing

## ئامانجەکان

له کاتی تەواوکردنی ئەم چاپتەرەدا دەبێت بتوانیت:

- ناسینەوەی نیشانەکانی سەختی هەناسەدان(DIB)
- هۆکارە مەترسیدارەکانی سەختی هەناسەدان
- ئەنجامدانی کردارە گرنگەکان بۆ هۆکارە مەترسیدارەکان(high-risk)کە دەبنە هۆی سەختی هەناسەدان.

## تێڕوانینی گشتی

سەختی هەناسەدان (DIB) زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی کۆمەڵێک حاڵەت بەکاردێت لە هەستکردن بە هەناسە تەنگیەوە تا جوڵەی هەناسەدانی ئاسایی، یان هەر هەوڵێکی زیادە کە پێویستە بۆ هەناسەدان. DIB دەتوانێت لە ئەنجامی کێشەکانی بۆری هەوا لە سەرەوە یان خوارەوە، سییەکان، دڵ یان ماسولکەکانی کە بۆ هەناسەدان بەکاردەهێنرێن یان بەهۆی هەندێک حاڵەتەوە کە ڕەنگە ببنە هۆی خێراترکردنی هەناسەدان (وەک کەمخوێنی یان ناهاوسەنگی کیمیایی (chemical imbalance).

DIBدەتوانێت ڕوودات بەهۆی:

- گیرانی بۆری هەواجا سەرەوە یان خوارەوە بێت(گیران بەهۆی شتێکەوە spasm of the airways,
- asthma بەهۆی ئاوسانی بەهۆی هەستیاری,هەوکردن یان بریندرابوون
- شلە لە بۆشایی سییەکان (pneumonia or pulmonary oedema)
- هەوا یان شلەلە دەرەوەی سییەکان کە دەبێتە هۆی داڕمان یان پاڵەپەستۆی سییەکان ( pneumothorax (or plural effusion
- خوێن مەین لەو لولە خوێنانەی خوێن بۆ سییەکان دابنین دەکەن
- هەر هۆکارێکی تری کەمبوونەوەی ئۆکسجین کە لە خوێندا هەڵدەگیرێت (وەک کەمخوێنی)
- ئەو حاڵەتانەی کە ڕێژەی هەناسەدان زیاد دەکەن وەک خواردنی ژەهراوی، ناهاوسەنگی کیمیایی (example diabetic ketoacedocis)) یان دڵەڕاوکێ.

ئامانجی (NITIAL ASSESSMENT) بریتییە لە دیاریکردنی هۆکارە گەڕاوەکانی سەختی هەناسەدان، و ناسینەوەی ئەو حاڵەتانەی کە پێویستیان بە دەستێوەردانی بەپەلە یان گواستنەوەی خێرا هەیە.
ئامانجی (ACUTE MANAGMENT) دڵنیابوونە لەوەی کە بۆری هەوا بە کراوەیی دەمێنێتەوە و هەناسەدان بەشی پێویست هەیە بۆ گەیاندنی ئۆکسجین بۆ ئەندامەکان.

### بیرهێنانەوە...

- ✓ هەمیشە لە ڕێبازی ABCDE هەنگاو بە هەنگاودەست پێ بکە، بەپێی پێویست دەستوەردان و کار بۆ نەخۆشەکە بکە.
- ✓ پاشان مێژوویەکی نموونەیی (SAMPLE HISTORY)ئەنجام بدە.
- ✓ پاشان (SECONDARY SURVEY)ئەنجام بدە.

# ABCDE: KEY ELEMENTS FOR PATIENTS WITH DIFFICULTY IN BREATHING

**بۆ ئەو نەخۆشەی کە هەناسەدانی قورسە واتە بە زەحمەت هەناسە دەدەن ئەمانەی خوارەوە توخمە سەرەکییەکانن کە پێویستە لە ڕێبازی ABCDEدا لەبەرچاو بگیرێن**

---

## AIRWAY

**ئەو کەسەی ناتوانێت بە باشی هەناسە بدات و کێشەی هەیە لە هەناسەدان لەوانەیە بەهۆی ئاوساوی بۆری هەواوە بێت کە هۆکارەکەی دەکرێت ( هەستیاریی توند واتە ئەنافیلاکسیس، یان خنکان بێت بەهۆی شتێکەوە) هەروەها** Stridor **دەکرێت نیشانەی تەسکبونەوەی بۆریەکانی هەوا بێت.**

---

## BREATHING

**دابەزینی فشاری خوێن لەگەڵ نەمانی دەنگی هەناسە لە لایەکی سییەکان بەتایەت ئەگەر هاتوو**
**نیشانەکانی** distended (swollen or enlarged) neck veins or tracheal shift **لەگەڵ بوو لەوانەیە**
**حاڵەتەکە** (tension pneumothorax) **بێت هەروەها خیزەی سەر سنگ لەوانەیە نیشانەی بوونی ڕەبۆ یان کاردانەوەی هەستیاریی توندەوە بێت.**

## CIRCULATION

**شۆک، جەڵتەی دڵ، سستبوونی دڵ و هەوکردنی توند هەموویان دەتوانن خۆیان نیشان بدەن لەگەڵ خراپی پەرفیوژن و سەختی هەناسەدان. خراپی پەرفیوژن سیگناڵ بۆ مێشک دەنێرێت بۆ زیادکردنی ڕێژەی هەناسەدان، کە دەتوانێت هەست بە سەختی هەناسەدان بکات. پشکنینی نیشانەکانی شۆک بە پشکنینی (پڕکردنەوەی موولوولەکان و لێدانی دڵ و پەستانی خوێن). ئاوسانی قاچ یان** (crackles) **دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ** heart failure and fluid overload **وەک هۆکارێک بۆ کێشەی هەناسەدان.**

## DISABLITY

**ئەو نەخۆشانەی ئاستی هۆشیارییان دابەزیوە لەوانەیە نەتوانن بۆری هەناسەیان بپارێزن. دەرمان، هەوکردن یان بریندداربوون دەتوانێت ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ئەو بەشەی مێشک هەبێت کە هەناسەدان کۆنترۆڵ دەکات.**
**هەڵسەنگاندن بۆ حاڵەتە ئیفلیجکەرەکان کە کاریگەرییان لەسەر ماسولکەکانی هەناسەدان هەیە.**
**ئاستی هۆشیاری بە پێوەری** AVPU **بپشکنە**

## EXPOSURE

**نەخۆشەکە بە تەواوی جەستەیی بپشکنە بۆ هەڵسەنگاندنی جوڵەی نائاسایی دیواری سنگ و هەر نیشانەیەکی زەبری دزەپێکراو بۆ پشت، سنگ، ژێر باڵ یان سک کە دەکرێت زۆرجار زیانیان بە سییەکان گەیاندبێت .**

---

# ASK: KEY HISTORY FINDINGS FOR PATIENTS WITH DIFFICULTY IN BREATHING

ڕێبازی SAMPLE بەکاربهێنە بۆ بەدەستهێنانی مێژوو لە نەخۆشەکە و/یان خێزانەکە. ئەگەر مێژووەکە بارودۆخێکی ABCDE دەستنیشان بکات، دەستبەجێ بوەستە و بگەڕێوە بۆ ABCDE بۆ بەڕێوەبردنی.

S: SIGNS AND SYMPTOMS ☒

**نیشانەکان کەی دەستیان پێکردووە و لەناکاو سەریهەڵداوە؟ ئایا دێن و دەڕۆن واتە تاو تاوە؟و تا چەند دەمێننەوە؟ ئایا بە تێپەڕبوونی کات گۆڕاون و پێشتر هەمان نیشانەی هاوشێوەی هەبووە؟**

سەختی لەناکاو لە هەناسەدان دەتوانێت پێشنیاری گیرانی بۆری هەوا بکات وەک (گیران بە تەنێکی نامۆ یان ئاوسانی بۆری هەوا بەهۆی کاردانەوەی هەستیاریی واتە ئەنەفیلاکسیس یان هەوکردن و بەرکەوتنی زەبرە بۆری هەوا، سییەکان، دڵ یان دیواری سنگ یان هەڵمژینی گازە گەرمەکان و دوکەڵ. کێشە توندەکانی دڵ وەک جەڵتەی دڵ، ڕیتمێکی نائاسایی دڵ یان کێشەی بەستەرەکان دەتوانن ببنە هۆی دەستپێکردنی خێرای DIB. مێژووی هەناسەدانی خێرا یان قووڵ لەوانەیە پێشنیاری ژەهراویبوون، بەرزبوونەوەی ئاستی ترش لە خوێندا (KETOACIDOSIS) یان دڵەڕاوکێ بکات. DIB کە بە هێواشی دەست پێدەکات زیاتر لەگەڵ هەوکردن و حاڵەتە درێژخایەنەکاندا باو دەبێت وەکو کۆبوونەوەی وردە وردەی شلە لە دەوری سییەکان ، شلەی دەوروبەری دڵ ( PERICARDIAL TEMPONADE)، شێرپەنجەی سییەکان یان نەخۆشییەکان کە کاریگەرییان لەسەر کارکردنی دیواری سنگ هەیە. دووبارەبوونەوەی سەختی هەناسەدان کە پەیوەندی بە سییەکان هەیە لەوانەیە پێشنیاری یان نەخۆشی COPD بکات.

**ئایا هیچ شتێک بووەتە هۆی سەختی هەناسەدان و چی وای لێدەکات باشتر بێت یان خراپتر؟**

مێژووی هەستیاریی لەوانەیە ئەوە پیشان بدات کە بۆری هەوا بەهۆی ئاوساویی کە ئەویش بەهۆی کاردانەوەی توندی هەستیارییەوە گیراوە. هەڵمژینی دوکەڵ یان گازی گەرم یان هەندێک مادەی کیمیایی لەوانەیە ببێتە هۆی DIB لە ڕێگەی برینداربوونی بۆری هەوای سەرەوە و ئاوساویی. بەرکەوتن بە هەندێک مادەی کیمیایی ( certain pesticides) دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی شلە لە بۆری هەوادا و دەبێتە هۆی لاوازبوونی ماسولکەکانی بەشدار لە هەناسەدان. سەختی هەناسەدان خراپتر دەبێت کاتێک کەسەکە بە تەختی پاڵکەوتووە کە ئەمەش دەکرێت بەهۆی شلەی ناو سییەکانەوە بێت.

**ئایا هیچ ئاوساویەک لە زمان یان لێوی نەخۆشەکە هەیە ، یان گۆڕانکاری لە دەنگدا هەیە؟**

ئاوسانی دەم، لێو، زمان یان بەشی سەرەوەی قوڕگ، یان گۆڕانی دەنگ دەتوانێت پێشنیاری کاردانەوەی هەستیاری توند یان هەوکردنی تری بۆری هەوا بکات.

**ئایا لەگەڵ هەناسەدان دەنگی نائاسایی هەیە؟**

دەنگی بەرز یان 'squeaking' لە کاتی هەناسەدانی (INHALATION) واتە هەناسەوەرگرتن لەوانەیە (stridor)بێت، کە بەهۆی تەسکبوونەوەی بۆری هەوای سەرەوە دروست دەبێت و لەوانەیە پێشنیاری کاردانەوەی

**هەستیاری توند یان گیرانی تری بۆری هەوا بکات. خیزەی سەر سنگ کە دەنگێکی بەرزە لەگەڵ هەناسەدانەوە دروست دەبێت – بەهۆی تەسکبوونەوە دروست دەبێت.**

**یان گرژبوونی بەشی خوارەوەی بۆری هەوا لە سییەکان روودەدات و دەتوانێت پێشنیاری رەبۆ، نەخۆشیCOPD ، (Heart failure)یان کاردانەوەی هەستیاریی بکات. دەنگی(gurgling) لەگەڵ هەناسەدان ئەوە دەردەخات کە بەڵغەم، خوێن یان شلەیەکی تر لە بۆری هەناسەدا هەیە.**

**ئایا ئازاری هەیە ئەوکاتەی توشی سەختی هەناسەدان دەبێت نەخۆشەکە پەیوەندی بە سەختی هەناسەدانەوە هەیە؟**

**سەختی هەناسەدان لەگەڵ ئازاری سنگ لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ (** heart attack, pneumothorax, pneumonia or trauma to the lungs, ribs or ribcage muscles)**. ئازارێک کە لەگەڵ هەناسەدانی قووڵدا خراپتر ببێت لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ هەوکردن یان مەینبوونی خوێن لە سییەکان (** pulmonary embolism)

**ئایا تا، کۆکەی هەیە؟**

**تا ئاماژە بە هەوکردن دەکات. هەوکردنی سییەکان و هەر هەوکردنێکی توند لەوانەیە ببێتە هۆی کۆبونەوەی شلە لە سییەکان. کۆکە لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ (شلەی ناو سییەکان لە هەوکردنی سییەکان یان ئاوسانی سییەکان) .کۆکە و خیزەی سنگ لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ (**asthma or COPD.)

**ئایا ئاوسانی پێ یان قاچ هەیە؟ یان دووگیانی بەم دواییە؟**

**سەختی هەناسەدان لەگەڵ ئاوسانی هەردوو پێ یان قاچەکان دەتوانێت پێشنیاری سستبوونی دڵ بکات لەگەڵ گەڕانەوەی شلەو کەڵەکەبوونی لە سیەکان و جەستە. سەختی هەناسەدان لەگەڵ ئاوسانی و ئازار لە قاچێکدا ڕەنگە ئاماژە بێت بۆ خوێن مەین لە خوێنبەرێکی قاچدا کە گەشتێکی بۆ سییەکان کردووە** (pulmonary embolism). **دووگیانی هۆکارێکی مەترسیدارە بۆ هەردوو(**pulmonary embolism and heart failur)

A: ALLERGIES ☒

**هیچ هەستیاریی بە دەرمان یان مادەی تر هەیە؟ هیچ پێوەدانێکی مێروو یان گەستن لەم دواییانەدا هەبووە؟**

**کاردانەوەی هەستیاری توند لەوانەیە ببێتە هۆی کێشەی هەناسەدان بەهۆی ئاوسانی بۆری هەوا. مرۆڤەکان دەتوانن کاردانەوەی هەستیاریی توندیان هەبێت بەرامبەر بە نزیکەی هەموو شتێک، بەڵام خۆراک، ڕووەک، دەرمان و پێوەدان/پەنجەی مێروو باوترینن.**

M: MEDICATIONS ☒

**لە ئێستادا هیچ دەرمانێک دەخۆیت؟**

**پرسیار بکە دەربارەی دەرمانی نوێ و گۆڕانکاری لە ژەمە دەرمانەکان. دەرمانی نوێ دەتوانن ببنە هۆی هەستیاری لەگەڵ کێشەی هەناسەدان. زیادەڕۆیی لە هەندێک دەرمان بەرێکەوت دەتوانێت هەناسەدان بوەستێنێت یان خاو بکاتەوە.**

P: PAST MEDICAL HISTORY ☒

**ئایا پێشینەی نەخۆشی ڕەبۆ یان نەخۆشی درێژخایەنی گیرانیی سییەکان (**COPD**) هەیە؟**

**زۆرجار ڕەبۆ و نەخۆشی COPD دەبنە هۆی تووشبوون بە سەختی هەناسەدان. مێژووی داغڵ کردنیان لە نەخۆشخانە پێشتر یان ئینتوبەیشن بۆ ئەم حاڵەتانە ئەوەمان بۆ دەردەخات ئەم نەخۆشانە زیاتر لە مەترسیدان و پێویستە زیاتر و وردتر چاودێری بکرێن .**

**ئایا پێشینەی نەخۆشی دڵ یان گورچیلە هەیە؟**

**ئەو کەسانەی کە پێشینەی لەکارکەوتنی دڵ یان گورچیلە(Heart,kidney failure)، لەوانەیە شلە لە سییەکاندا هەبێت. لەوانەیە جەڵتەی دڵ لەگەڵ سەختی هەناسەدان دەربکەوێت.**

**ئایا پێشینەی نەخۆشی سیل یان شێرپەنجە هەیە؟ حاڵەتەکانی وەک سیل و شێرپەنجە دەبنە هۆی کۆبوونەوەی شلە لە کیسی دەوروبەری دڵ (pericardial effusion) یان کۆبوونەوەی شلە لە دەرەوەی سییەکان(plural effusion) ، کە هەردووکیان دەبنە هۆی هەستکردن بە سەختی هەناسەدان.**

**ئایا پێشینەی نەخۆشی شەکرە هەیە؟ نەخۆشی شەکرە دەتوانێت ببێتە هۆی (Diabetic keto acidosis)دەبێتە هۆی هەناسەدانی خێرا کە ڕەنگە وەک سەختی هەناسەدان ڕاپۆرت بکرێت.**

**ئایا مێژووی جگەرەکێشان هەیە؟ جگەرەکێشان ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشی ڕەبۆ و نەخۆشی COPD و شێرپەنجەی سییەکان و جەڵتەی دڵ زیاد دەکات.**

**ئایا پێشینەی تووشبوون بە ئایدز هەیە؟ تووشبوون بە ڤایرۆسی ئایدز ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دیکە زیاد دەکات.**

L: LAST ORAL INTAKE ☒

**پڕبوونی گەدە، نەخۆشەکە دەخاتە مەترسی ڕشانەوە و ئەگەری خنکاندن زیاد دەکات.**

E: EVENTS SURROUNDING ILLNESS ☒

**ئەو کەسە چی دەکرد کاتێک سەختی هەناسەدان دەستی پێکرد؟**

**هەمیشە بیر لە خنکان بکەرەوە ئەگەر DIB لە کاتی خواردن یان خواردنەوە دەستی پێکردبوو .لەگەڵ وەرزشکردن لەوانەیە بەهۆی جەڵتەی دڵەوە بێت، بە تایبەت کاتێک ئازاری سنگیشی هەیە.**

**ئایا نەخۆشەکە لەناو ئاو یان لە نزیک ئاو دۆزرایەوە؟ هەمیشە بیر لە خنکان (هەڵمژینی ئاو یان چونی ئاو بۆ ناو سییەکان) بکەرەوە لە کەسێکدا کە لەناو ئاو یان لە نزیک ئاودا دەبینرێت. تەنانەت بڕێکی کەم لە هەڵمژینی ئاو دەبێتە هۆی زیانێکی گەورە بە سییەکان، ئەمەش بە تێپەڕبوونی کات خراپتر دەبێت.**

**ئایا بەرکەوتن بە( pesticides) یان مادەی کیمیایی تر هەبووە؟ ماددە کیمیاییە هەڵمژراوەکان دەتوانن ببنە هۆی DIB. هەندێک لە ڤرکەرەکان کە لە کشتوکاڵدا بەکاردەهێنرێن دەتوانن لە ڕێگەی پێستەوە هەڵبمژرێن و دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی شلە لە بۆری هەوا و سییەکان. بەرکەوتن بە گازەکان لە ئاگرەوە زۆرجار پەیوەندی بە هەڵمژینی ماددە کیمیاییەکانەوە هەیە.**

**ئایا لەم دواییانەدا هیچ زەبرێک هەبووە؟ هەناسە تەنگیDIB بەرکەوتنی زەبر نیگەرانییە بۆ( شکانی پەراسووەکان،** (pneumothorax,haemothorax,heart or lung bruising

# CHECK: SECONDARY EXAMINATION FINDINGS FOR

# PATIENTS WITH DIFFICULTY IN BREATHING.

لەوانە یە لەگەڵ( گۆڕانکاری لە ڕێژەی هەناسەدان، هەوڵی (DIFFICULTY IN BREATHING) هەناسەدان، یان کەمی تێربوونی ئۆکسجین )دەربکەوێت هەمیشە سەرەتا هەڵسەنگاندن بۆ ABCDE بکە , ڕێبازی سەرەتایی ABCDE حاڵەتە مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان دەستنیشان دەکات و بەڕێوەی دەبات.( Secondary exam ) بەدوای گۆڕانکاری لە باروودۆخی نەخۆشەکەدا دەگەڕێت یان هۆکارە کەمتر دیارەکان کە لەوانەیە لە کاتی ABCDEدا لەدەستچووبن دیاریی دەکات. ئەگەر( Secondary exam) حاڵەتێکی ABCDE دەستنیشان کرد، دەستبەجێ بوەستە و بگەڕێوە بۆ ABCDE بۆ بەڕێوەبردن و یارمەتیدانی نەخۆشەکە لە چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتە.

## سەیرکردن

بەدوای نیشانەکانی Rispiratory failure بگەڕێ:

- بەکارهێنانی Accessory muscles .
- سەختی قسەکردن بە ڕستەی تەواو.
- نەتوانینی پاڵکەوتن یان پاڵدانەوە.
- (ئارەقکردنەوەی زۆر) و Mottled skin .
- سەرلێشێواوی، تووڕەبوون، وروژاویی.
- خراپی جوڵەی دیواری سنگ.
- Cyanosis (ڕەنگی پێست شین بەتایبەت لێو و سەری پەنجە).

سەیری بیلبیلەی چاوی بکە بۆ قەبارە و کاردانەوە:

- بیلبیلەی زۆر بچووک پێشنیاری ئەگەری زیادەڕۆیی لە ژەمی ئۆپیۆید یان بەرکەوتن بە ماددە کیمیاییەکان دەکەن(لەوانەیش pesticides).
- بیلبیلەی نایەکسان یان شێوەی نائاسایی پێشنیاری بریندارببوونی سەر دەکات کە دەتوانێت ببێتە هۆیهەناسەدانی نائاسایی

سەیری دەمو چاو و لووت و دەم بکەن:

- سییانۆس لە دەوری لێو یان لووت ئاماژەیە بۆ دابەزینی ئاستی ئۆکسجین لە خوێندا.
- ڕووی ئاوەوەی کاڵبوونەوەی پێڵوی خوارەوەی چاو ئاماژەیە بۆ کەمخوێنییەکی توند.
- ئاوسانی لێو و زمان و دەم ئاماژەیە بۆ کاردانەوەی هەستیاریی.
- کۆڵی دەوری دەم یان لووت، سووتانی مووی دەموچاو یان سووتانی دەموچاو پێشنیاری هەڵمژینی دوکەڵ و سووتانی بۆری هەوا دەکات.
- خوێنبەربوون یان ئاوسانی بۆری هەناسە لەوانەیە بەهۆی زەبرەوە بێت.

سەیری مل و سنگ بکە:

- هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانی مل(Distended neck vein)دەتوانێت بەهۆی Back-up ی خوێنەوەبێت کە ئەمەش دەکرێت بە هۆی بەهۆی( Heart failure,tension pneumothorax, pericardial temponade)
- بەکارهێنانی زۆری ماسولکەکان لە مل و سنگ (لە نێوان پەراسووەکان)دا ئاماژەیە بۆ سەختییەکی بەرچاوی هەناسەدان.
- ئەگەر trachea بۆ لایەک جولابوو ئاراستەکەی، بیر لە tension pneumothorax or tumor بکەرەوە.
- ئاوسانی یان سووربوونەوەی مل ئاماژەیە بۆ هەوکردن یان زەبر.
- بە وردی پشکنینی تەواوی مل و سنگ بکە بۆ ئەوەی بزانیت سوربونەوە ،برین یان نیشانەکانی تری زەبر.

سەیری ڕێژە و شێوازی هەناسەدان بکە:

- ئەو کەسانەی کە (Wheeze) هەیە، ڕەنگە هەناسەدانیان زیاتر بخایەنێت بەهۆی تەسکبوونەوەی بەشی خوارەوەی بۆری هەوا لە سییەکان.
- هەناسەدانی خێرا دەتوانێت بەهۆی وشکبوونەوە، هەوکردنی توند، ناهاوسەنگی کیمیایی لە خوێندا، ژەهراویبوون یان دڵەڕاوکێ بێت.
- هەناسەدانی خاو و قووڵ لەوانەیە بەهۆی زیادەڕۆیی لە ژەمی دەرمانی ئۆپیۆید بێت. بەدوای بیلبیلەیی زۆر بچووک و گۆڕانی باری دەروونیدا بگەڕێ.
- زۆرجار بریندداربوونی دیواری سنگ پەیوەندی بە ئازارەوە هەیە کە توانای هەناسەدانی قووڵ سنووردار دەکات.
- flail chest
- کاتێک ڕوودەدات کە چەندین پەراسوو شکابن کە دەبێتە هۆی جیابوونەوەی بەشێک لە قەفەزی سنگ لە باقی دیواری سنگ. لەوانەیە وا دەربکەوێت کە ئەو بەشە بە ئاراستەی پێچەوانە لە باقی دیواری سنگ لە کاتی هەناسەداندا.

سەیری قاچەکان بکە:

- ئاوسانی هەردوو بەشی خوارەوە قاچ ئاماژەیە بۆ سستبوونی دڵ وەک هۆکارێک بۆ سەختی هەناسەدان.
- ئاوسانی قاچێک لەوانەیە بەهۆی خوێن مەین بێت لە قاچدا. ئەگەر سەختی هەناسەدانیش هەبوو،
- ئەمەش لەوانەیە بەو مانایە بێت کە بەشێک لە مەینەکە ڕۆشتوە بۆ سییەکان.

سەیری پێست بکە:

- گەستن دەتوانێت سەرچاوەی کاردانەوەی هەستیاریی بێت.
- پەڵە وەکو شانە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ کاردانەوەی هەستیاریی. کاتێک پەیوەندی بە سەختی هەناسەدانەوە هەیە، پەڵە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ هەوکردنی بەربڵاو (سیستەمی).
- بێڕەنی پێست یان pale skin (پێستی کاڵ) دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ کەمخوێنی وە هۆکارێک بۆ DIB.
- Circumferential burn (سووتانێک کە بە تەواوی بە دەوری بەشێکی لەشدا دەڕوات) بۆ سنگ دەتوانێت فراوانبوونی دیواری سنگ سنووردار بکات و هەناسەدان سنووردار بکات.

## گوێگرتن

گوێ لە دەنگەکانی هەناسە بگرە:

-ستریدۆر پێشنیاری گیرانی بەشێکی بۆری هەوا لە بەشگ سەرەوە دەکات، کە لەوانەیە بەهۆی شتێکی نامۆ، mass، یان ئاوسان بە هۆی زەبر یان هەوکردنەوە بێت.
- کەمبوونەوەی یان نەبوونی دەنگی هەناسەدان ئاماژەیە بۆ جوڵەی نائاسایی هەوا لە سییەکان. ئەمەش دەتوانێت بەهۆی هەوا یان شلەی دەوروبەری سییەکانەوە بێت.

(pneumothorax,haemothorax,effusion)، تەسکبوونەوە یان گیران بەهۆی تەنی نامۆ لە بۆری هەناسەدان، و هەوکردن یان وەرەم لەناو سییەکان یان دەوروبەری سییەکان.

- wheezing خیزەی سنگ : بە تایبەتی، پێشنیاری گیرانی بۆری هەوا لە بەشی خوارەوە دەکات وەک رەبۆ، نەخۆشی COPD، کاردانەوەی هەستیاریی، بوونی تەنی نامۆ یان وەرەم.
- Crackles or crepitation پێشنیاری شلە لە بۆشایی سییەکان (airspaces)دەکات.

گوێ لە دەنگەکانی دڵ بگرە:

- نائاسایی ڕیتمەکانی دڵ دەبێتە هۆی ئەوەی دڵ بە شێوەیەکی نائاسایی خوێن پەمپ بکات و دەبێتە هۆی خراپی پەرفیوژن و هەستکردن بە سەختی هەناسەدان.
- سەختی هەناسەدان کە لەگەڵ murmurی دڵدا بێت دەتوانێت پێشنیاری تێکچوونی زمانەکانی دڵ بکات.
- Muffled or distand heart sound
- لەگەڵ دابەزینی پەستانی خوێن و لێدانی دڵی خێرا و هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانی مل ( Distended neck vein) پێشنیاری ( Pericardial temponade)دەکات.

## هەست

- هەست بە پەراسووەکان و دیواری سنگ بکە:
- شێواوی و جوڵەی نائاسایی لەکاتی بوونی فشار لەسەر دیواری سنگ پێشنیاری شکانی پەراسوو دەکات.
- Crepitus
- (Crackling or popping when pressing on the skin of the chest wall) لەوانەیە پێشنیاری شکان یان هەوا لە ژێر پێست بکات کە پەیوەندی دارە بە pneumothorax
- فراوانبوونی نایەکسانی دیواری سنگ پێشنیاری(pneumothorax,haemot ,or flail chest)دەکات
- Percuss the chest wall
- hallow sound (hyperresonance ) لە لایەکدا لەکاتی لێدانی دیواری سنگدا پێشنیاری pneumothoraxدەکەن.
- دەنگی dull لە کاتی لێدانی دیواری سنگدا ڕەنگە ئاماژە بێت بۆ شلە یان خوێن یان لە ناو بۆشایی سییەکان یان لە نێوان سییەکان و دیواری سنگدا

# POSSIBLE CAUSES OF DIFFICULTY IN BREATHING

**هۆکارەکانی سەختیی هەناسەدان دەکرێت جیا بکرێنەوە بە گوێرەی بەشەکانی جەستە(ڕێڕەوی هەوا،سییەکان،دڵ ، تەواوی جەستە)**

## Key airway cause

| باڕودۆخ | نیشانەکان |
| --- | --- |
| Foriegn body in the airway | **سەختی لە هەناسەدان ئەگەرهات و لەپڕ ڕوویدا.**<br>**ئەگەر بێت و دەردراوی وەک ڕشانەوە یان تەنی نامۆ بوە هۆی گیرانی بۆری هەوا دەنگی نامۆ لە ڕێرەوی هەوا هەبوو وەک**(stridor,snoring,gurgling)<br>**کۆکە.**<br>.Drooling |
| severe allergic ) (reaction | **ئاوسانیی زمان،لێو ،دەم.**<br>**ستریدۆر یان خیزەی سنگ.**<br>**لەوانەیە لێدسنی دڵی زیاد بکات و زەختی دابەزێت.**<br>**بەرکەوتەی لەگەڵ ئەو شتە هەبێت کە هەستیاریی پێی هەیە.** |
| Airway swelling (due to inflammation/ (infection | Stridor<br>Hoarse voice<br>Drooling,**یان توانای قوتدانی نابێ نەخۆشەکە کە ئەمە نیشانەی ئاوسانیی زۆرە ناتوانێت پاڵکەوێت.**<br>**لەوانەیە تا ی هەبێت ئەگەر هاتوو هەوکردن هەبوو لە جەستەیدا.** |
| Airway burn | **مێژووی بەرکەوتنی بە ماددەی کیمیایی یان ئاگر.**<br>**سوتانیی سەر و مل (سووتانی مووەکانی دەموچاو یان ڕەنگی ڕەساسی لە دەوری دەم و لوت)**<br>Stridor<br>**گۆڕان لە دەنگ.** |

# Key lung causes

| بارودۆخ | نیشانەکان |
|---|---|
| Pneumonia | هەبوونی تا +کۆکە.<br>Gradually more labored breathing<br>بوونی ئازار کاتی هەناسەدان(pleuritic)<br>لە ماوەی پشکنین یان فیزیکال ئێکزامینەیشن گوێمان لە دەنگی (crackle)دەبێت. |
| Asthma/COPD | خیزەی سنگ،کۆکە ،بەکاهێنانی accessory muscle ەکان، tripod position, نەخۆشەکە<br>مێژووی جگەرە کێشان یان هەستیاریی هەیە. |
| Pneumothorax | کەمبونەوەی دەنگی هەناسە لە لایەکی سییەکان ، دەسپێکەکەی لە پڕە، دەنگی سییەکان hyper<br>resonance ە واتە Hollow sound ە،ئازارەکەی خراپتر دەبێت لە ماوەی<br>هەناسەدان،نەخۆشەکە مێژووی هەبێ کە زەبری بەرکەوتوە یان بەڵگەی شکانی پەراسوەکانیمان<br>هەبێ، پەستانی خوێنی دادەبەزێت و هەروەها distended neck vein ی هەیە وە کەمبونەوەی<br>هەناسەدان لە لایەکی سییەکانی نەخۆشەکە نیشانەی هەبوونی tension pneumothorax ە. |
| Haemothorax | دەنگی هەناسە کەم دەبێتەوە لەو لایە،لە ماوەی فێزیکاڵ ئیگزامیمەیشن دەنگی dull هەیەکاتێک<br>percussion ی بۆ دەکەین،نەخۆشەکە مێژووی (زەبر،شێرپەنجە،سیل، شۆک )ی لەوانەیە<br>هەبێت ئەگەر(large haemothorax) بێت. |
| Plueural effusion | کەمبونەوەی دەنگی هەناسەدان لە لایەک یان هەردوولای سییەکان، لە کاتی پێرکەشن dull<br>sound ە، نەخۆشەمە مێژووی ، شێرپەنجە،سیل،نەخۆشیەکانی دڵ ی هەبێت ، لەوانەیە کێشەیە<br>هەناسەدانی لە پڕ یان وردە وردە بۆ دروست بوبێ. |
| Acute chest syndrome in a patient with sickle dell disease | نەخۆشەکە مێژووی (sickle cell disease )هەیە،ئازاری سنگ،تا، کەمی ئۆکسجین. |

# Key heart causes

| بارودۆخ | نیشانەکان |
|---|---|
| Heart attack | هەستکردن بە توندی ، پەستان لەسەر سنگی،ئارەقکردنەوەی زۆر، mottled skin, هێڵنجدان<br>و ڕشانەوە،نیشانەکانی Heart failure, نەخۆشەکە مێژووی (جگەرە کێشان،نەخۆشیەکانی دڵ و<br>زەخت،شەکرە، بەرزی کۆلیسترۆڵ،لە خێزانیان بە گشتی نەخۆشیەکانی دڵ بوونی هەیە). |
| Heart failure | Worse with exertion, خراپتر دەبێت ئەوکاتەی نەخۆش پاڵدەکەوێت،ئاوساویی هەردوو<br>قاچ،هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانە مل واتە Distended neck vein, لەوانەیە گوێت لە دەنگی<br>crackle بێت لەکاتی فێزیکاڵ ئیگزامینەیشن لەهەردوو لای سییەکان،لەوانەیە ئازاری سنگی<br>هەبێ. |
| Pericardial temponade | نیشانەکانی کەمی ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین بۆ جەستە یان کەمی پێرفوژن(زیادبوونی لێدانی<br>دڵ زیادبوونی هەناسەدان ، دابەزینی پەستانیی خوێن،بێڕەنگی پێست،ساردیی لە<br>پەلەکان،کاپیلەری ریفیلڵ زیاترە لە سێ چرکە)،ئاوسانیی خوێن بەرەکان لە ملدا (distended<br>neck vein)، muffled heart sound, لەوانەیە نەخۆشەکە هەست بە وڕبوون، شڵەژان، و<br>باریی دەروونی گۆڕانی بەسەردا دێت، نەخۆشەکە مێژووی(سیل،زەبر،مەلیگنانسی، kidney<br>failure)هەیە. |

## Key systemic causes

| باروودۆخ | نیشانەکان |
|---|---|
| Anemia | بێ ڕەنگی لە پێڵوی خوارەوەی چاوو پێست هەستی پێ دەکرێت،زیادبوونی لێدانی دڵ،زیادبوونی هەناسەدان،نەخۆشەکە مێژووی(خوێن بەربون، malnourishment،شێرپەنجە،دووگیانی،مەلاریا، sickle cell disease, renal failure)هەیە. |
| Clinical or recreational opioid use | گۆڕانکاری لە باری دەروونی و ئاگایی، بیلبیلەی چاوی زۆر بچوک دەبێتەوە،هەناسەدانی خاو دەبێتەوە لەگەڵیشی زۆر قوڵە. |
| Diabetic keto acidosis | نەخۆشەکە مێژووی نەخۆشی شەکرەی هەیە،هەناسەدنی خێراو قوڵە،زوو زوو میز دەکات، sweet smelling breath,زیادبوونی ڕێژەی شەکر لە خوێن یان میز، وشکبونەوە. |

سەرەتا هەڵسەنگاندنی ABCDE ئەنجام بدە و دەستوەردان بکە بۆ حاڵەتە مەترسیدارەکانی ژیان. هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردنی بۆری هەوا و دابینکردنی (Bag valve mask) بۆ هەر نەخۆشێک کە هەناسەدان نییە یان هەناسەدانی بە پێی پێویست نییە (بە گوێرەی تەمەنی نەخۆشەکە زۆر خاو بێت یان زۆر قوڵ بێ)؛ هەر نەخۆشێکی بێهۆش کە هەناسەدانی نائاسایی (هێواش، قووڵ، هەناسەبڕکێ یان دەنگی نامۆ)ی هەبێت یان هەر نەخۆشێک کە پەڵسی هەیە و هەناسە نادات. بۆ ئەو نەخۆشانەی کە پەستانی خوێنیان نییە، پرۆتۆکۆڵە پەیوەندیدارەکانی CPR پەیڕەو بکە و ئەنجامی بدە.

| حاڵەت | بەڕێوەبردن |
|---|---|
| Airway inflammation or burns | نەخۆشەکان ئارام بکەرەوە. ئەگەر توانیت ئەم کارە بکەیت بەبێ ئەوەی نەخۆشەکە ئیزعاج بکەیت ئۆکسجینی بدە. ئەگەر نەخۆشەکە بە تەواوی وریا بێت و گومانی بریندارربوونی بڕبڕەی پشتی نەبێت، لەوانەیە بتوانێت  دانیشێت ئاسوودەتر بێت. ئەو نەخۆشانەی کە بۆری هەوا سووتاوە لەوانەیە پێویستیان بە ئینتوبەیشنی پێشوەختە هەبێت چونکە بۆری هەناسە دەتوانێت بە خێرایی توشی ئاوساوی بێت  و بگیرێت؛ دواکەوتن لەوانەیە ئینتوبەیشن قورستر بکات. کەسێک کە هەوکردنی بۆری هەوا یان سووتاوی هەیە پێویستی بە ڕادەستکردنەوە/گواستنەوەی بە پەلە هەیە. |
| Chocking | بە گوێرەی تەمەن دەست بکە بە (chest thrusts/abdominal thrusts/back blows) |
| Allergic reaction | هەموو جۆرە خشڵ و زێڕێک لە نەخۆشەکە بکەرەوە ئەگەر توانرا،بۆ ئەو کەسانەی کە بە سەختی توشی وەڵامدانەوەی هەستیاریی (ئەنافیلاکسس)بوون لە ڕێگەی ماسولکەوە ئەدرینالینی پێ بدە، بۆ کەیسە زۆر سەختەکان ئۆکسجین بە نەخۆشەکە بدە |
| Asthma/COPD | پێویستیان بە Salbutamol لەگەڵ ئۆکسجین هەیە. |
| Fever | ئەگەر گومان هەبوو هەوکردن بوبێتە هۆکاری سەختی هەناسەدان ، بە زووترین کات پێویستە دژە زیندەییەکان بدرێت بە نەخۆش ئەگەر نەخۆشەکە نیشانەکانی خراپی پەرفیوژنی هەبوو ، بە وریاییەوە شلەی IV پێ بدە بۆ ئەوەی  دورکەوینەوە لە حاڵەتی(fluid overload). |
| Heart attack | پێویستە ئۆکسجین بدرێت بە نەخۆش ، لە کاتێکدا لە کاتێکدا چیتر ئۆکسجین بۆ هەموو ئەو نەخۆشانەی کە جەڵتەی دڵیان هەیە پێشنیار ناکرێت،بەڵام لە سەرەتادا پێویستە بدرێت بەو نەخۆشانەی کە تووشی شۆک بوون یان کێشەی هەناسەدان هەیە. [بڕوانە لێهاتووییەکان] بۆ ئەو |

| | |
|---|---|
| | نەخۆشانەی کە پێشتر دەرمانی نایترۆگلیسیرینیان هەبووە ، دەتوانیت یارمەتیان بدەیت لە خواردنی بەڵام بەو مەرجەی ئەگەر پەرفیوژنەکە گونجاو بێت. |
| Chronic ,severee anemia | پێویستە شلەی IVیان بە هێواشی پێ بدرێت وە چاودێری بەردەوام و پشکنین بۆ سییەکانی بکرێت بۆ ئەگەری بوونی (crackle)،ئەم نەخۆشانە لەوانەیە پێویستیان بە گواستنەوە/ڕادەستکردنەوە هەبێت بۆ گواستنەوەی خوێن. |
| Diabetic keto acidosis | لە ڕێگەی ivیەوە شلەی پێ بدە،(بڕوانە لێهاتویەکان). ئەو نەخۆشانەی کیتۆئەسیدۆسسن بە زووی حاڵیان خراپ دەبێت بۆیە پێویستی بە گواستنەوەی بەپەلە هەیە بۆ دابینکەرێکی پێشکەوتوو. |
| Opiod overdose | پێویستە یارمەتی هەناسەدانی بکەیت لە ڕێگەی(Bag Valve Mask) وە وە پێویستە Naloxone پێ بدرێت. |
| Plural effusion or haemothorax | ئۆکسجین بدە بە نەخۆش، ئامادەی بکە بۆ گواستنەوە/ڕادەسکتردنەوە چونکە زۆربەی نەخۆشەکان پێویستیان بە chest tube دەبێت. |
| Trauma | هەموو ئەو نەخۆشانەی زەبریان بەرکەوتوە و کێشەی هەناسەدانیان بۆ دروست بوە واتە بە زەحمەت توانای هەناسەدانیان هەیە پێویستە ئۆکجسجینیان پێ بدرێت،هەروەها لە ڕێگەی ئایڤیەوە پێویستە شلەیان پێ بدرێت بۆ یارمەتیدانی دڵ لە پەمپکردنی خوێن ئەگەر گومانی pericardial temponade or tension pneumothoraxکرا. وە پێویستە ڕاستەوخۆ Needle decompression ی بۆ بکرێت ئەگەر tension pneumothorax بوو. لە ڕێگەی three sided dressing حاڵەتی sucking chest wound بەڕێوە ببە(بڕوانە لێهاتوویەکان). نەخۆشەکە پێویستە ڕاستەوخۆ بەپەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکرێت ئەگەرهاتوو needle decompression یانیش three sideed dressingمان بۆ ئەنجامدابوو. |
| Acute chest syndrome | پێویستە (ئۆکسجین ، شلە لە ڕێگەی ivیەوە،دەرمانی دژە زیندەگیەکان ی پێ بدرێت )وە لەوانەیە پێویست بە گواستنەوە/ڕادەستکردنەوە بکات بە دابینکەرێکی پێشکەوتوو. |

## ڕەچاوکردنی تایبەت لە منداڵاندا

**ئەمانەی خوارەوە نیشانەی مەترسین لە منداڵدا:**

یەکەم:نیشانەکانی گیرانیی بۆڕی هەوا( منداڵەکە ناتوانێت لیکی ناو دەمی قوت بدات،(drooling,stridor)

دووەم:زیادبوونی پێویستی هەناسەدان(هەناسەدانی خێرا،nasal flaring، grunting,chest indrawing or retractions)

سێیەم:Cyanosis:شین بونەوەی پێست بەتایبەت دەوری لێو وە سەریی پەنجە.

چوارەم: گۆڕانی باری دەروونی (بێهێزی یان خەواڵوویی نائاسایی، وروژان)

پێنجەم:کەمی خواردن و خواردنەوە

شەشەم:منداڵەکە هەر شتێک بخوات دەیرشێنێتەوە.

حەوتەم:گەشکە

هەشتەم:کەمبونەوەی پلەی گەرمیی(hypothermia)

## بیرهێنانەوە...

**خیزەی سەر سنگ لە منداڵاندا لەوانەیە هۆکارەکەی توشبون بە هەوکردن بێ بەهۆی ڤایرۆسەوە، ڕەبو یانیش هەڵمژینی شتێک کە بوبێتە هۆی گیرانیی بۆڕی هەوا.**

لە منداڵاندا لەوانەیە بۆهۆی گیرانیی بەشی سەرەوەیبۆری هەوا بێت یانیشئاوسانی بۆری هەوابێتStridor

لەوانەیە منداڵان بە هەناسەدانی خێرا وەک تاکە نیشانەی هەوکردنی سییەکان خۆیان نیشان بدەن.
هەناسەدانی خێرا دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ (Diabetic ketoacidosis)، کە لەوانەیە یەکەم نیشانەینەخۆشی شەکرە بێت لە منداڵدا.

# Disposition considerations

ئەوەت بیربێت کە کاریگەری ئەو دەرمانانەی کە نەخۆشەکە هەڵی دەمژێت لەوانە سالبوتامۆڵ تەنیا بە نزیکەیی بۆ ماوەی سێ کاتژمێر دەمێننەوە بۆیە پێویستە تۆ وەک پەرستار چاودێری بەردەوامی نەخۆشەکە بکەیت بە وردیی.

- ئەو نەخۆشانەی کە توشی وەڵامدانەوەی هەستیاریی توند (severe allergic reaction) بوو ئەدرینالێیت بە نەخۆشەکە دابوو دەکرێت هەستیاریەکەی بۆ دوبارە بێتەوە ئەوکاتەی ئەدرینالێنەکە لە جەستەی نەخۆشەکە نامێنێت و کاریگەریەکەی تەواو دەبێت. بۆیە پێویستە زۆر بەوردیی چاودێری نەخۆشەکە بکەیت.
- Naloxone بە نزیکەیی یەک کاتژمێر دەمێنێتەوە لە جەستەدا ، زۆربەی دەرمانە Opiod ەکان زیاتر دەمێننەوە .زۆربەی نەخۆشەکان پێویست دەکات ژەمی دەرمانی Naloxoneیان بۆ دوبارە بکرێتەوە
- ئەگەر کەسێک لە ئاودا نوقم بێت (خنکان)، ڕەنگە دوای چەند کاتژمێرێک نیشانەکانی کێشەی هەناسەدانی هەبێت و پێویستە لە نزیکەوە چاودێری بکرێت.
- هەرگیز ئەو نەخۆشانەی کە ڕەنگە پێویستیان بە دانانی بۆری هەوا هەبێت لە کاتی ڕادەستکردنەوە/گواستنەوەدا بەبێ چاودێری مەهێڵەرەوە. دڵنیابە لەوەی کە دابینکەرێکی نوێ چاودێری نەخۆشەکە دەکات پێش ڕۆشتن.
- هەر نەخۆشێک کە ڕەنگە پێویستی بە هەواگۆڕکێی یارمەتیدەر (assisted ventilation) هەبێت، بە زووترین کات کارەکانی گواستنەوەی ڕێک بخە.

MULTIPLE CHOICE QUESTIONS

Answer the questions below. Questions and answers will be discussed in the session

1. You are evaluating a 34-year-old female complaining of difficulty in breathing, coughing, and fever for 3 days. Which of the following actions should you do first?

A. Check blood pressure

B. Administer antibiotics

C. Start an IV

D. Check the lung sounds

2. A 67-year-old man with a history of a heart attack is complaining of difficulty in breathing

that is worse whenever he lies flat. His legs are both swollen, which has become worse in the past 2 weeks. What is the most likely cause of his difficulty in breathing?

A. Heart failure

B. Asthma

C. Pneumothorax

D. Pneumonia

3. There was a fire in a nearby house and a patient is brought to you with burned nasal hairs and shortness of breath. What should you do first?

A. Give oxygen

B. Give intramuscular adrenaline

C. Start an IV line

D. Perform needle decompression

4. A 30-year-old woman was stung by a bee and now has difficulty in breathing, facial swelling, and a rash. She has a history of severe allergic reactions to bee stings. What medication should

you give her?

A. Naloxone

B. Benzodiazepine

C. Adrenaline

D. Aspirin

5. You are assessing a 10-year-old boy for difficulty in breathing. You notice that the skin on his fingertips and around his mouth has a blue color. What is this finding called?

A. Retractions

B. Nasal flaring

C. Crepitus

D. Cyanosis

# Chapter 4: Approach to shock

## ئامانجەکان

لەم چاپتەرەدا زانیاری وەردەگریت دەربارەی:

- ناسینەوەی نیشانەکانی شۆک/کەمی پێرفوژن
- ئەنجامدانی گرنگرتین کارەکان بۆ نەخۆشێک کە شۆک بووە
- پشکنین بۆ شلەی لەش
- هەڵبژاردنی باشترین و گونجاوترین جۆری شلە بە گوێرەی تەمەن،کێش،حاڵەتی نەخۆش
- ناسینەوەی malnutrition،کەم خوێنی، سوتاوپی ،هەروەها ڕێکخستنی جۆری شلە( fluid resuscitation )

# تێڕوانینی گشتی

**کەمی ڕۆشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین( کەمی پێرفوژن) کاتێک ڕوودەدات کە جەستە یاخود ئەندامە بنەڕەتیەکان خوێنی پڕ ئۆکسجینیان بە تەواوی پێنەگات، کاتێک ئەمە ڕوودەدات نەخۆشەکە لەوانەیە ببێتە شۆک و بەزووی چارەسەر نەکرێت دەکرێت ببێتە هۆی مردنی کەسەکە، (ساوا،منداڵان، پیر) ئەو گروپانەن کە دەکرێت زووتر توشی شۆک ببن**

# ئەو هۆکارانەی دەکرێت سەربکێشێت بۆ شۆک و نەخۆشەکە بکوژێت:

- **لەدەستدانی خوێن بەهۆی خوێن بەربونەوە(** hemorrhage)
- **لەدەستدانی شلەی جەستە بەهۆی ( سکچون،ڕشانەوە،سوتاویی بە گوێرەی قوڵیەکەی،زۆری میزکردن ئەگەر هۆکارەکەی بەرزی شەکری ناو خوێن بێت).**
- **کەمی وەرگرتن و خواردنەوەی ئاو، وەک دەزانین منداڵان و بەساڵاچوان زیاتر لە کەسانی دیکە دەکرێت توشی کەم ئاویی ببن چونکە کەمتر ئاو دەخۆنەوە و زۆربەی جار پێویستیان بە یارمەتی ئەوانی تر هەیە ،بۆیە ئەگەری وشکبونەوەیان زیاترە.**
- **شلبوونەوەی نائاسایی و گەورەبوون (فراوانبوون)ی خوێنبەرەکان (بە هەمان بڕی خوێن لەناو خوێنبەرەکاندا) دەتوانێت پەستانی خوێن دابەزێنێت و ئەمەش دەتوانێت لە (هەوکردنی توند و بریندارببوونی بڕبڕەی پشت و کاردانەوەی هەستیاری توندا ڕووبدات).**
- **خراپ پڕبوونی دڵ(**Heart filling) **دەشێت بەهۆی بوونی خوێن یان شلەیەکی تر لە پەردەی دەوروبەری دڵ بێت** (pericardial temponade)**یان بەرزبوونەوەی پەستان لە قەفەزەی سنگدا کە دەتوانێ لولە خوێنەکان لە شوێنی ئاسایی خۆی لابدات و و ڕێگری بکات لەوەی کە خوێن بگەڕێتەوە بۆ دڵ** (tension pneumothorax)
- **نەتوانینی پەمکردنی خوێن بەباشی لەلایەن ماسولکەکانی دڵەوە دەکرێت بەهۆی جەلدەی دڵەوە بێت(لولە خوێنەکان دەگیرێن و دەبنە هۆی تێکچونی لەناکاوی ماسولکەکانی دڵ) بوونی وەڵامدانەوەی هەوکردن یان نەخۆشیەکانی تری ماسولکەکانی دڵ وەک کێشەی ڕیتم یان زمانەکان .سەرهەڵدانی شۆک بەهۆی شکست هێنانی دڵ لە پەمپکردنی خوێن بەباشی هەندێک جار پێی دەوترێ (**cardiogenic shock).

**بیرت بێت...**

**ئامانجی** intila assessment **بریتیە لە دیاریکردنی شۆک وە بەر هۆکارێ ببێتە هۆی گەڕانەوەی شۆک**
**ئامانج لە** Acute managment **بریتیە لە گێڕانەوەی** perfusion(**گەشتنی خوێنی پڕ ئۆکسجین بۆ ئەندامەکان و و چارەسەرکردنی لەدەستدانی شلە بەردەوامەکان لە هەر شوێنێک کە بگونجێت.**

**بیرت بێت**

- هەمیشە بە ABCDE دەست پێ بکە
- دواتر Sample History وەربگرە
- دواتر Secondary examination ئەنجام بدە

## ABCDE: توخمە سەرەکییەکان لە شۆکدا

**بۆ ئەو کەسەی کە تووشی شۆک بووە، ئەمانەی خوارەوە توخمە سەرەکییەکانن کە پێویستە لە ڕێبازی ABCDEدا لەبەرچاو بگیرێن.**

| | |
|---|---|
| AIRWAY | **ئاوسانی دەم و چاو یان گۆڕانی دەنگ دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ کاردانەوەی هەستیاریی. کاردانەوەی هەستیاری توند دەتوانێت ببێتە هۆی شۆک.** |
| BREATHING | **خیزەی سنگ دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ کاردانەوەی هەستیاری توند کە دەکرێت ببێتە هۆی شۆک.**<br>**شۆک، سەختی هەناسەدان و نەبوونی دەنگی هەناسەدان لە لایەک دەکرێت ئاماژە بێت بۆ** tension pneumothorax **خراپی پەرفیوژن خۆی هەندێک جار لەوانەیە ببێتە هۆی هەناسەدانی خێرا کاتێک ئەندامە گرنگەکان ئۆکسجینی پێویست وەرناگرن.**<br>**سستبوونی توندی دڵ** (severe heart failure)**دەبێتە هۆی خراپی پەرفیوژن لەگەڵ سەختی هەناسەدان کاتێک شلە دەگەڕێتەوە سەرەوە بۆ ناو سییەکان وە هەر هەوکردنێک ئەوەندە توند بێت کە ببێتە هۆی شۆک لەوانەیە پەیوەندی بە هەوکردنی سییەکانەوە هەبێت کە دەبێتە هۆی کێشەی هەناسەدان.** |
| CIRCULATION | **شۆک دەکرێت بەهۆی چەندین جۆری خوێنبەربوونەوە بێت (لە گەدە یان ڕیخۆڵەکانەوە، پەیوەست بە دووگیانی، و خوێنبەربوونی ناوەوە و دەرەوە بەهۆی زەبرەوە).**<br>**شۆک دەتوانێت لە ئەنجامی لەدەستدانی شلەی پەیوەست بە (سکچوون، ڕشانەوە، سووتانی بەرفراوان، یان میزکردنی زیادە (نمونە هۆکارەکەی بەهۆی بەرزبوونەوەی شەکری خوێنەوە) بێت.** |
| DISABILITY | **سەرلێشێواوی لە کەسێکدا کە پەرفیوژنی خراپی هەیە، ئاماژەیە بۆ شۆکی توند. ئیفلیجی لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ برینداربوونی بڕبڕەی پشت کە دەبێتە هۆی شۆک.** |
| EXPOSURE | **بەدوای نیشانەکانی خوێنبەربوون و زەبر و ئارەقەکردنەوەیەکی زۆردا بگەڕێ** Hives **لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ کاردانەوەی هەستیاریی و پەڵەی تر دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ هەوکردنی سیستەماتیکی.** |

# ASK:KEY HISTORY FINDING IN SHOCK

S:Sign and symptoms ✓

**ئایا ڕشانەوە و/یان سکچوون هەبووە؟ بۆ ماوەی چەند؟**

**لەدەستدانی شلە لە ڕێگەی ڕشانەوە و سکچوونەوە ئەگەر زۆر بێت دەبێتە هۆی شۆک. بڕی ڕشانەوە یان سکچوون دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ خەمڵاندنێکی ورد بۆ مەترسییەکانی شۆک، بۆیە هەمیشە پرسیار بکە دەربارەی فریکوێنسیی ڕووداوەکان.**

**ئایا کەسەکە خوێنی لە پیساییدا یان ڕشانەوەدا هەبووە؟**

**خوێنبەربوون لە گەدە و/یان ریخۆڵەکاندا دەکرێت توند بێت و مەترسی دروست بکات بۆ کەسەکە پێش ئەوەی بناسرێتەوە. مرۆڤ دەتوانێت بەشێکی بەرچاو لە قەبارەی خوێنی لە ریخۆڵەکاندا لەدەست بدات. لەوانەیە خوێن لە هەردوو ڕشانەوە و پیساییدابە ڕەنگی ڕەش دەربکەوێت.**

**ئایا هیچ خوێنبەربوونێک لە زێدا هەبووە؟**

**خوێنبەربوونی زێ لەوانەیە پەیوەندی بە دووگیانیەوە هەبێت لە ژناندا. هەمیشە پرسیار بکە دەربارەی دۆخی دووگیانی، دوایین سوڕی مانگانە، هەر سوڕی مانگانەیەک کە دواکەوتبێ، یان  دووگیانی. لەدەستدانی خوێن لە کاتی منداڵبوونی ئاسایی یان لەبارچوون دەبێتە هۆی شۆک. هەروەها دووگیانییەک کە لە دەرەوەی منداڵدان گەشە دەکات سکپڕی دەرەوەی منداڵدان یان (ectopic pregnancy) ئەگەر بپچڕێت دەتوانێت مەترسی لەسەر ژیانی دروست بکات).**

Ectopic preganancy ruprure

**دەکرێت پێش ئەوەی ئافرەتەکە تەنانەت بزانێت کە دووگیانە. هۆکارەکانی تری خوێنبەربوونی زێ بریتین لە بوونی mass لە cervix یان منداڵدان.**

**ئایا کەسەکە هیچ ئازارێکی سنگی هەبووە؟**

**ئازاری سنگ لەوانەیە ئەوە دەربخات کە کەسەکە جەڵتەی دڵی هەبووە. زیانەکان گەشتن بە ماسولکەکانی دڵ بەهۆی جەڵتەی دڵەوە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توانای پەمپکردنی خوێن بە دەوری جەستەدا، ئەمەش دەبێتە هۆی شۆک**

**ئایا تا هەبووە؟**

**ڕەنگە تا ئاماژە بە هەوکردن بکات وەک هۆکارێک بۆ  شۆک. هەوکردنی توند دەبێتە هۆی هەم فراوانبوونی خوێنبەرەکان (کە پەستانی خوێن دادەبەزێنێت) و هەم دزەکردنی شلە لە خوێنبەرەکانەوە**

**(لەگەڵ لەدەستدانی شلە و ڕۆشتنیان بۆ ناو شانەکان)**

**ئایا هیچ بەرکەوتنێک بە ژەهر، دەرمان، پێوەدانی مێروو یان مادەی تر هەبووە؟**

**کاردانەوەی توندی هەستیاریی دەتوانێت ببێتە هۆی شۆک. سەرەڕای ئەوەش، زۆرێک لە دەرمانەکان، لەوانەش دەرمانی پەستانی خوێن و گەشکە، دەتوانن ببنە هۆی شۆک.**

**ئایا گۆڕانی باری دەروونی یان خەواڵوویی نائاسایی هەبووە؟**

**مێشک یەکێکە لە کۆتا ئەندامەکان کە بەهۆی خراپی پەرفیوژنەوە کاریگەری لەسەر دەبێت، بۆیە گۆڕانی باری دەروونی ڕەنگە نیشانەی شۆکێکی توند بێت.**

- A:allergy ✓

**ئایا کەسەکە هیچ هەستیاریەکی ناسراو و دیاریکراوی هەیە؟**

**کاردانەوەی هەستیاری دەتوانێت ببێتە هۆی شۆک بەهۆی شلبوونەوە**(Abnormal relaxation) **نائاسایی بۆرییەکانی خوێن.**

- M:Medication ✓

**لە ئێستادا هیچ دەرمانێک دەخوات کەسەکە؟**

**لیستی تەواوی دەرمانەکان لە کەسەکە یان خێزانەکە وەربگرە. زانینی لیستی دەرمانەکانی نەخۆشەکە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ تێگەیشتن لەوەی بۆچی نەخۆشەکە تووشی شۆک بووە (وەک دەرمانی دڵ). ژمەی زۆری دەرمانی پەستانی خوێن یان گەشکە دەتوانێت ببێتە هۆی شۆک، و ڕەنگە چارەسەرکردنی شۆک لە هەر هۆکارێکی دیکە قورستر بێت لەو نەخۆشانەی کە ئەم دەرمانانە دەخۆن. ئەو دەرمانانەی خوێن شل دەکەنەوە دەتوانن خوێنبەربوون خراپتر بکەن. هەمیشە پرسیار بکە دەربارەی دەرمانە نوێیەکان بە تایبەتی و گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییەی ژمە دەرمانەکان بۆ هەڵسەنگاندنی کاردانەوەی هەستیاریی یان کاریگەرییە لاوەکییە چاوەڕواننەکراوەکان.**

- P:past medical history ✓

**مێژووی دووگیانی یان لەبارچوون یان منداڵبوون بەم دواییە؟**

**لەدەستدانی خوێن دوای منداڵبوون دەکرێت زۆر بێت ئەگەر منداڵدان بە باشی گرژ نەبێت. لەدەستدانی خوێنی شاراوە کە دەبێتە هۆی شۆک دەتوانێت لەگەڵ** rupture ectopic pregnancy **ڕووبدات، تەنانەت لەو ژنانەشدا کە نازانن دووگیانن. هەر ژنێک لە تەمەنی منداڵبووندا تووشی شۆک بێت دەبێت هەڵسەنگاندنی بۆ دووگیانی بۆ بکرێت مێژووی نەشتەرگەری ئەم دواییە یان**induced abortion ؟

**خوێنبەربوونی ناوەوە یان هەوکردن دوای نەشتەرگەری دەبێتە هۆی شۆک.**

**پێشینەی نەخۆشی دڵ (جەڵتەی دڵ یان کێشەی زمانەکانی دڵ)؟**

**ئەو نەخۆشانەی نەخۆشی دڵیان هەیە مەترسی خراپتربوونی کارکردنی دڵیان لەسەرە کە لەوانەیە ببێتە هۆی شۆک یان خراپتربوونی شۆک بەهۆی هۆکاری ترەوە.**

**ئایا پێشینەی تووشبوون بە ئایدز هەیە؟**

**ئایدز مەترسی تووشبوون زیاد دەکات.**

- ✓ L:last oral intake

**دوایین جار کەسەکە کەی خواردن و خواردنەوەی خواردوە؟**

**ئەو کەسەی بە باشی خواردن و خواردنەوە ناخوات، تووشی وشکبوونەوەی توند دەبێت و دەبێتە هۆی شۆک.**

- ✓ E:Event surrounding illness

**ئایا لەم دواییانەدا هیچ زەبرێک هەبووە؟**

**زەبر دەبێتە هۆی خوێنبەربوونی شاراوەی ناوەکی، tension pmeumothorax و bruising یان خوێنبەربوون لە دەوروبەری دڵ، هەموو ئەمانە رەنگە رۆیشتنی خوێن کەم بکەنەوە و ببنە هۆی شۆک. جگە لەوەش، زەبر لە مل یان پشت کە دەبێتە هۆی بریندااربوونی بڕبڕەی پشت دەتوانێت کاریگەری لەسەر توانای خوێنبەرەکان هەبێت بۆ پاراستنی پەستانی خوێن.**

**ئایا هیچ نەخۆشییەک لەم دواییانەدا هەبووە؟**

**هەر هەوکردنێک دەبێتە هۆی هەوکردنی خوێن کە دەتوانێت بە هەموو جەستەدا بڵاوبێتەوە و ببێتە هۆی شۆک.**

# CHECK :SECONDARY EXAMINATION FINDING IN SHOCK

**ئەو کەسەی تووشی شۆک دەبێت، نیشانەکانی خراپی پەرفیوژنی دەبێت، کە لەوانەیە بریتی بێت لە (خێرای لێدانی دڵ ، دابەزینی پەستانی خوێنی سیستۆلیک، هەناسەدانی خێرا، پێستی کاڵ و سارد، پڕکردنەوەی موولوولەکان یان کاپیلەری ڕیفیلی هێواشە، سەرگێژخواردن، سەرلێشێواوی، گۆڕانی باری دەروونی، کەمبوونەوەی دەرچوونی میز یان زۆر ئارەقکردنەوە).**

**لەبیرت بێت: تەنانەت پێش دابەزینی پەستانی خوێن دەکرێت پەرفیوژن سنووردار بوبێ، بە تایبەت لە گەنجەکاندا.**

**دابەزینی پەستانی خوێن لەگەڵ خراپی پەرفیوژن نیشانەیەکی زۆر جدییە.**

**هەمیشە سەرەتا هەڵسەنگاندن بۆ ABCDE بکە. ڕێبازی سەرەتایی ABCDE حاڵەتە مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان دەستنیشان دەکات و بەڕێوەیان دەباتSecondary Exam بەدوای گۆڕانکاری لە بارودۆخی نەخۆشەکەدا دەگەڕێت یان هۆکارە کەمتر دیارەکان کە لەوانەیە لە کاتیABCDE دا لەدەستچووبن و تێبینیت نەکردبێت. ئەگەر Secondary Examحاڵەتێکی ABCDE دەستنیشان کرد، دەستبەجێ بوەستە و بگەڕێوە بۆ ABCDE بۆ بەڕێوەبردنی.**

**لەبیرت بێت: منداڵان مەودای نیشانە زیندەگیەکان(vital signs)یان جیاوازە، ئەو منداڵانەی کە شۆکیان هەیە لەوانەیە گۆڕانکاری لە نیشانە گرنگەکاندا نەبێت تاوەکو زۆر نەخۆش دەربکەون،بۆیە پێویستە هەمیشە پشکنینی ورد ئەنجام بدەیت بۆ هەر نیشانەیەکی شۆک.**

## پشکنینی دەنگی هەناسەدان و ڕێژەی هەناسەدان:

**هەناسەدانی نائاسایی یان ژاوەژاو دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ هەوکردنی سییەکان وەک سەرچاوەیەک بۆ هەوکردنی سەرتاسەری سیستەماتیکی کە دەبێتە هۆی شۆک. بەرزی ئاستی شەکر دەتوانێت ببێتە هۆی ناهاوسەنگی کیمیایی (Diabetic ketoacidosis)کە لەش هەوڵدەدات بە هەناسەدانی خێراتر یان قووڵتر چارەسەری بکات. هەروەها ئەم حاڵەتە ڕەنگە ببێتە هۆی sweet smelling یان'fruity' بەو پێیەی بەرزبوونەوەی ئاستی گلوکۆزی خوێن دەبێتە هۆی زیادبوونی میزکردن، دەبێتە هۆی وشکبونەوەی توند و شۆک.**

## پشکنین بۆ خوێنبەربوون:

**پێویستە هەموو خوێنبەربوونی دەرەکی بە فشاری ڕاستەوخۆ(Direct pressure) کۆنترۆڵ بکرێت. [بڕوانە لێهاتووییەکان] خوێنبەربوونی خوێنبەرەکان(Atrial bleeding)لەوانەیە وەک pulsing یان high pressure bleeding دەربکەوێت، و قەبارەی خوێنی بەرچاو و زۆر دەتوانێت لە چەند خولەکێکدا لەدەست بدات. خوێنبەربوونی زێ لەوانەیە سەرچاوەیەکی گرنگی لەدەستدانی خوێن بێت لە خوێنبەربوونی پەیوەست بە دووگیانی (تەنانەت لەو کەسانەی کە پێیان وایە دووگیان نین) یان بەهۆی بوونی mass لە ناو ملی ڕەحم یان منداڵدان.**

**پشکنین بۆ دۆخی شلەی لەش**(fulid state)**بکە**:

**لە حاڵەتی وشکبوونەوەدا، نەخۆشەکە هەست بە تینوێتی دەکات یان لەوانەیە لێو و دەمی وشک بێت،** Abnormal Skin pinch**، بێهێزی و دەرەنگ پڕبونەوە موولوولەکان یان کاپیلەری ڕیفیڵ. ئەو نەخۆشانەی کە تووشی سستبوونی دڵ**(Heart failure)**بوون دەتوانن تووشی شۆک بن بەهۆی**Fluid overload **و لەوانەیە ئاوسانی خوارەوەی جەستەیان هەبێت (بەزۆری لە هەردوو قاچدا)**

Crackle**لەکاتی پشکنینی سییەکان، و هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانی مل واتە**Distended neck vein

**پشکنینی پێڵوی چاو** pale conjuctive (**ناوەوەی پێڵوی خوارەوەی چاو**):

**ڕەنگی پێستی کەسەکە گرنگ نییە، پێویستە ناوەوەی پێڵوی چاوی پەمەیی و شێدار دەربکەوێت. ئەگەر بەشی ناوەوەی پێڵوی چاو کاڵ بوو، لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ لەدەستدانی خوێنی بەرچاو.**

**دەتوانیت پێڵووی چاوی نەخۆشەکە بەراورد بکەیت بە کەسێکی تەندروست یان چاوی خۆت لە ئاوێنەدا.**

**پشکنینی باری دەروونی**:

**سەرلێشێواوی لە نەخۆشێکدا کە نیشانەکانی تری خراپی پەرفیوژنی هەیە، ئاماژەیە بۆ شۆکی توند.**

**پشکنین بۆ تا**:

**تا لە نەخۆشێکی تووشبوو بە شۆک ئاماژەیە بۆ هەوکردنی توند.**

**پشکنینی شەکری خوێن**:

**کەمی گلوکۆزی خوێن هەندێک جار دەتوانێت وەک شۆک دەرکەوێت. ئەگەر ناتوانیت گلوکۆزی خوێن بپشکنیت، بەڵام کەسەکە باری دەروونی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، پێشینەی نەخۆشی شەکرە یان هۆکارێکی تر بۆ کەمبوونەوەی شەکر (بۆ نموونە دەرمانی** quinene **بۆ مەلاریا دەخوات، زۆر نەخۆشە، یان بە توندی بەدخۆراکە)ڕاستەوخۆ گلوکۆزی پێ بدە (بڕوانە لێهاتوییەکان).**

**پشکنین بۆ ئازاری توندی سک یان**:Very firm Abdomin

**ئەگەر کەسەکە ئازارێکی زۆری سکی هەبوو، ئەمە دەتوانێت نیشانەی خوێنبەربوون یان هەوکردن بێت لە سکیدا. لە نەخۆشێکدا کە ڕەنگە دووگیان بێت، ئەمە دەتوانێت نیشانەی دووگیانی دەرەوەی منداڵدان بێت.**

**پشکنینی میز**:

**ڕەنگ و قەبارەی میزەکە بپشکنە بڕێکی کەم لە میزو ڕەنگی تۆختر لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ وشکبوونەوەی جەستە.**

## پشكنینی پیسایی:

هەر سكچوونێكی بەرچاو دەتوانێت ببێتە هۆی وشكبوونەوەی لەش. برێكی زۆر لە پیسایی كە وەک ئاوە " Rice Water"پێشنیاری كۆلێرا دەكات، كە دەتوانێت بە خێرایی ببێتە هۆی وشكبوونەوەی توند و شۆک. پیسایی ڕەنگی ڕەش، تۆخ، یان سوور دەتوانێت پێشنیاری خوێنبەربوونی گەدە یان ڕیخۆڵە بكات

## پشكنین بۆ بەدخۆراكی بكە( بڕوانە لێهاتووییەكان).

ئەگەر كەسەكە بەدخۆراک دەركەوت، دەبێت پێدانی شلە بە شێوەی ڕێكخراو بێت و لەسەرت پێویستە بۆی ڕێكبخەیت

[بڕوانە لێهاتووییەكان]. دڵنیابە پرسیار بكە دەربارەی گۆڕانكارییەكانی ئەم دواییەی كێشی كەسەكە.



Assessing for pitting edema in children with malnutrition

Visible severe wasting in a child

## پشكنین بۆ ئاوساوی، پەڵە یان ئارەقكردنەوەی زۆر:

ئاوسانی دەم یان جەستە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ كاردانەوەی هەستیاریی. پەڵە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ كاردانەوەی هەستیاریی (Hives) یان هەوكردنی سیستەماتیكی. ئاوسانی هەردوو قاچ دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ سستبوونی دڵ(Heart Failure). لەوانەیە ئارەقەكردنەوە لەكاتی بوونی شۆكێكی مامناوەند بۆ توند ڕووبدات.

# POSSIBLE CAUSES OF SHOCK

## POOR PERFUSION DUE TO DILATED BLOOD VESSELS

| نیشانەکانی | بارودۆخ |
|---|---|
| بەرزی پلەی گەرمی جەستە(تا)،زیادبوونی لێدانی دڵ،زیادبوونی هەناسەدان،لەوامەیە نەخۆش پەستانی خوێنی دابەزێت،لەوانەیە سەرچاوەی هەوکردنەکە ببینین لەوانەیە نادیاریش بێت (پێستێک کە توشی هەوکردن بوبێ،کۆکەو هەبوونی دەنگی crackle لە لایەکی سییەکان هەروەها زۆربەی جار زیادبوونی لێدانی دڵی لەگەڵە،سوتانەوە لەکاتی میزکردندا، any focal pain in association with fever ,cloudy or foul smelling | Severe infection |
| مێژوو یان نیشانەی بەرکەوتنی زەبر،لەوانەیە نەخۆشەکە ئازاری پشتtenderness ی هەبێت، هەروەها نارێکی لە بڕبڕەکانی هەبێت، کاتێک دەست لە ئێسکەکانی پشت دەدەین(crepitus (crunching هەبێت.<br>کێشەی ڕۆشتن ( شەلەل،لاوازای ،ڕیفلێکسەکانی نائاساین) کێشەی هەستەوەرەکانtingling “pins and needles” sensationلەدەستدانی هەست نەخۆشەکە ناتوانێت کۆنترۆڵی میز /پیسایکردن بکات.<br>Priapism<br>لەوانەیە نەخۆشەکە پەستانە خوێنی دابەزێت یان لێدانی دڵی خاو ببێتەوە،کێشەی هەناسەدان ئەگەر زیان بە بڕبڕەکانی مل گەشتبێ. | Spinal cord injury |
| ئاوسانیی دەم ، زەحمەتی لە هەناسەدان وە دەنگی خیزە یان stridor،پەڵەی پێست،زیادبوونی لێدانی دڵ، دابەزینی پەستانیی خوێن. | Severe allergic reaction |

## POOR PERFUSION DUE TO FLUID LOSS

| نیشانەکانی | بارودۆخ |
|---|---|
| نەخۆشەکە لەوانەیە مێژووی نەخۆشی شەکرەی هەبێت، هەناسەدانی خێرا و قوڵە،زوو زوو میز دەکات،بۆنی هەناسەکانی شیرینە(sweet smell breathing)، ڕێژەی شەکر لەناو میز یان خوێنی بەرز بێ،وشکبونەوە. | Diabetic ketoacidosis |
| Abnormal skin pinch،کەمی خواردن و خواردنەوەو زۆری لەدەستدانی شلە بەهۆی رشانەوە،سکچون،زۆری میزکردن،وشکی mucous membrane،زیادبوونی لێدانی دڵ. | Severe dehydration |
| سوربونەوە،سپی ،ڕەشبونی پێستەکە بە گوێرەی قوڵی سوتاویەکە،لەوانەیە برینەکە بلّقی دروستکردبێت،لەوانەیە نیشانەکانی inhalation injury هەبێت. | Burn injury |

## POOR PERFUSION DUE TO BLOOD LOSS

| بارودۆخ | نیشانەکانی |
|---|---|
| External bleeding | مێژووی زەبر.<br>خوێنبەربوونی دیار .<br>بەکارهێنانی دەرمانی خوێن شل کەرەوە. |
| Large bone fracture | مێژووی زەبر<br>ئازار یان جوڵەی نائاسایی حەوز، خوێن لێهاتنە ئەندامی نێرینە یان کۆم (شکانی حەوز).<br>شێواوی یان crepitus لە ئێسکی ڕان، کورتبوونەوەی قاچ لەگەڵ برینداربوونیدا (شکانی ئێسکی ڕان.) |
| Abdominal bleeding | سوربونەوەی دەوری ناوک یان کەلەکەی نەخۆشەکە دەکرێت نیشانەی خوێن بەربونی ناوەکی بن،ئازاری سک ، very frim abdomen. |
| Bleeding on the stomach or intestines | بوونی خوێن لە ناو ڕشانەوە یان پیسایی،ڕەنگی ڕەش لە ڕشانەوە یان پیسایی،مێژووی بەکارهێنانی کهول. |
| Haemothorax | نەخۆشەکە بە قورسی هەناسە دەدات، لەولایەی سییەکان کە حاڵەتەکەی هەیە دەنگی هەناسە نامێنێ، لەکاتی پشکنین بە percussion ئەو دەنگەی دەستمان دەکەوێت dullە،شۆک ئەگەر خوێنەکە زۆربێت. |
| Ectopic pregnancy | نەخۆشەکە خۆی دوگیان بێت، دواکەوتنی سوڕی مانگانە لە ژناندا،ئازاری سک ، لەبەر ڕۆشتنی خوێن لە زێ. |
| Postpartum hemorrhage | نەخۆشەکە بەم نزیکانە منداڵی بووە، خوێنێکی زۆری لێ دەڕوات لە زێ کە نیشانەکانی بریتین لە (سانتیەکەی هەر پێنج دەقە جارێک پێویستە بگۆڕێت، خوێن بەربونەکە>٢٥٠مل،منداڵدانی نەرمە یان بەشی خوارەوەی سکی زۆر نەرمە،constant trickling blood. |

**بیرت بێت:**

**دابەزینی شەکری خوێن زۆربەی نیشانەکانی لە شۆک دەچێت لەوانە:**

**ئارەقکردنەوەی زیاد لە پێویست،گەشکە، ڕێژەی گلوکۆز<mmol/l3.5،گۆڕانی باری دەرونیی و ئاگایی نەخۆش(لە شڵەژانەوە دەکرێت ڕووبدات تاوەکو بێهۆشبوون)،مێژووی نەخۆشی شەکرە،مەلاریا،بوونی نەخۆشە دیکە بەتایبەت لە منداڵاندا.**

# DO:MANAGEMENT

سەرەتا هەڵسەنگاندنی ABCDE ئەنجام بدە و دەستووەردان بکە بۆ ئەو بارودۆزانەی مەترسین بۆسەر ژیانی نەخۆش. سەرەتا بە پێدانی شلەی IV (خوێنی ئاسایی یان رینگەر لاکتات لە گەورەکان و منداڵانی Normal nutritional state دەست پێ بکە. پاشان کار بکە بۆ چارەسەرکردنی هۆکارە بنەڕەتییەکان. سەرەتا پێویستە IV بە خێرایی دابنێی (Two-large-bore IV) و شلەی IV پێ بدە .وەڵامدانەوەی دۆخی نەخۆشەکە واتە ریسپۆنسی هەڵسەنگێنە. ئەگەر پێویست بوو بە بۆلۆسی زیادە دووبارەی بکەرەوە. [بڕوانە لێهاتوویيەکان] ئەگەر ناتوانیت IV دابنێیت، دەستبەجێ پەیوەندی بە دابینکەرێکەوە بکە کە بتوانێت Nasogastric tube دابنێت یان intraosseous line دابنێت (دەرزییەک کە راستەوخۆ دەخرێتە ناو ئێسکەوە). بزانە ئایا نەخۆش دەتوانێت لەم نێوەندەدا شلە لە رێگەی دەمەوە بە سەلامەتی بخوات

---

هۆشیاری! بۆ ئەو کەسانەی کە بەدخۆراکی زۆریان هەیە یان کەمخوێنییەکی زۆریان هەیە، یان هەر کەسێک کە نیشانەکانی Volume overloadیان هەیە، پرۆتۆکۆڵی شلەی خوارەوە پەیڕەو مەکە. پرۆتۆکۆڵی رێکخراو بەکاربهێنە. [بڕوانە لێهاتوویەکان]

---




ئەگەر خوێنبەربوونی زێ لە دوای منداڵبوون (خوێنبەربوونی دوای منداڵبوون) وەک هۆکاری شۆک گومانی لێ بکرێت:

هەموو نەخۆشەکان پێویستیان بە ڕادەستکردنی خێرا/گواستنەوەی خێرا هەیە بۆ دابینکەری پێشکەوتووی منداڵبوون.

لەکاتێکدا کار بۆ رێکخستنی گواستنەوە وە هەروەها لە کاتی گواستنەوەدا، گرنگە هەوڵبدرێت خوێنبەربوونەکە بوەستێنرێت. هەردوو ئۆکسیتۆسین لە رێگەی ماسولکەیی و IV پێ بدرێت کە ئەمەLoading doseە. دوای ئەم ژەمە دەرمانانە، بەردەوام بە لە ئۆکسیتۆسین IV تا یەک کاتژمێر دوای وەستانی خوێنبەربوونەکە. [بڕوانە لێهاتوويیەکان] خوێنبەربوون زۆرجار ڕوودەدات و ئەگەر منداڵدان بە تەواوی گرژ نەبووبێت (هەست بە رەقی منداڵدان ناکەیت لەکاتی دەست لێدان واتە (palpation) مەساجی منداڵدان ئەنجام بدە [بڕوانە لێهاتوويیەکان] تاوەکو منداڵدان ڕەق دەبێت.

پێویستە هەردوو جۆری ئۆکسیتۆسین و مەساجی منداڵدان بەکاربهێنیت بۆ وەستاندنی خوێنبەربوونەکە. ئەگەر Placentaهاتە دەرەوە، لەناو(Leak priof container) دا کۆی بکەرەوە و لەگەڵ نەخۆشەکەدا بیهێڵەرەوە بۆ ئەوەی رێگە بە دابینکەری پێشکەوتووی منداڵبوون بدات پشکنینی بۆ بکات.

لە رێگەی سەیرکردنەوە لە دەرەوە پشکنین بۆ درانیPerineal یان زێ. ئەگەر رویدابوو، بە گۆزی تەعقیمکراو فشارێکی راستەوخۆ بخەرە سەر و قاچەکانی پێکەوە بنوسێنە. تەنانەت ئەگەر خوێنبەربوونەکە بوەستێت، ئەم نەخۆشانە هێشتا پێویستیان بە رادەستکردنەوە/گواستنەوەی خێرا هەیە بۆ دابینکەرێکی پێشکەوتووی منداڵبوون (بروانە وێنەکە).




لەبیرت بێت... شلە تەنها کێشەی دەستبەجێی پەرفیوژن چارەسەر دەکات. ئەو نەخۆشانەی کە شۆکیان هەیە پێویستیان بە رادەستکردنەوە/گواستنەوەی خێرا هەیە بۆ یەکەیەک کە توانای چارەسەرکردنی هۆکارەکانی شۆک و دابینکردن و بەڕێوەبردنی پێشکەوتووی هەبێت، لەوانەش گواستنەوەی خوێن.

لەبیرت بێت... هەڵسەنگاندنی دۆخی شلە زۆر گرنگە ئەو نەخۆشانەی کە نیشانەکانی خراپی پەرفیوژنیان هەیە بەڵام بەگشتی Volume Overloadوادەکات بەڕێوەبردنیان قورس بێت. ئەو نەخۆشانەی کە بەدخۆراکی و کەمخوێنی توند و شلەی زیادەیان لە سییەکان هەیە بەهۆی (لەکارکەوتنی دڵ، جگەر، یان گورچیلە دەتوانن بەم شێوەیە خۆیان نیشان بدەن). ئەم نەخۆشانە هێشتا پێویستیان بە شلەمەنی هەیە، بەڵام دەبێت شلەمەنیەکان بە وریاییەوە و بەتایبەتی لە منداڵانی بەدخۆراکیدا بەپێی پرۆتۆکۆڵێکی دیاریکراو پێ بدرێت. [بڕوانە لێهاتوییەکان]

# DO: MANAGEMENT OF SPECIFIC CONDITIONS

هەمیشە سەرەتا ABCDE ئەنجام بدە. ئەو نەخۆشانەی کە تووشی شۆک بوون پێویستیان بە ئۆکسجین هەیە.
لە هەموو جۆرەکانی شۆکدا، بەڕێوەبردنی سەرەتایی بریتییە لە بەڕێوەبردنی شلەی IV کە گونجاوە لەگەڵ تەمەن و باروودۆخ.
ئەم حاڵەتانەی خوارەوە پێویستیان بە ڕەچاوکردنی زیاتر هەیە.

| حاڵەت | بەڕێوەبردن |
|---|---|
| Burns | سوتان دەکرێت بەربەستەکانی پێست بشکێنێت و ببێتە هۆی لەدەستدانی بڕی پێویستی شلەی لەش کە هۆکارێت بۆ شۆک، هەر لەبەر ئەمەیە نەخۆشەکان پێویستە بڕی شلەی لەدەستچوویان بۆ قەرەبوو بکرێتەوە بە گوێرەی حاڵەتەکەیان(بڕوانە لێهاتوویەکان). |
| Hyperglycemia | ئەگەر گومانی ئەوەی لێکرا کە Diabetic ketoacidosis بێت، حاڵەتەکە بەڕێوەدەنرێت لە ڕێگەی پێدانی شلەی IVیەوە(بڕوانە لیهاتوییەکان)،بێگومان وەک دەزانین Diabetic ketoacidosis حاڵەتێکی مەترسیدارەو پێویست دەکات ڕاستەوخۆ بەپەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بەپەلە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتوو کە توانای پێدانی شلەی IV و چارەسەری بەپەکەو چاودێری کردنی وردی هەبێت. |
| Hyperglycemia | ئەگەر گومانی ئەوەی لێکرا کە Diabetic ketoacidosis بێت، حاڵەتەکە بەڕێوەدەنرێت لە ڕێگەی پێدانی شلەی IVیەوە(بڕوانە لیهاتوییەکان)،بێگومان وەک دەزانین Diabetic ketoacidosis حاڵەتێکی مەترسیدارەو پێویست دەکات ڕاستەوخۆ بەپەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بەپەلە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتوو کە توانای پێدانی شلەی IV و چارەسەری بەپەکەو چاودێری کردنی وردی هەبێت. |
| Spinal cause | ئای ڤی فلودی پێ بدەو دەست بە جێ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بە یەکەیەکی پێشکەوتوو. |
| | |

| | |
|---|---|
| Stomach or intestinal bleeding | فلودی لە ڕێگەیIV یەوە پێ دەدەین ، وە هەروەها ڕاستەوخۆ کاری گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بۆ دەکەین بۆ گواستنەوەی خوێن(بڕوانە لێهاتوویەکان). |
| Ectopic pregnancy | فلودی لە ڕێگەی IVیەوە پێ دەدەین وە هەروەها ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی دەکەین بۆ یەکەی منداڵبون . |
| Postpartum hemorrhage | ئۆکسیتۆسین و شلەی ئای ڤی پێ بدە وە بەپەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بۆ یەکەیەکی منداڵبون و چاودێرت دایکی دووگیان.ئای ڤی فلودی پێ بدە و منداڵدان مەساج بکە تا ڕەق دەبێت(بڕوانە لێهاتوییەکان)<br>ئۆکسیتۆسینی پێ بدە.<br>ئەگەر placenta delivery بوو هەوڵ بدە لەleak proof container هەڵی بگرە تا Advanced providerێک دەیبینێ.<br>پشکنین بکە بۆ perineal ,vaginal tears وە ئەگەر هەبوو پەستانی ڕاستەوخۆی بخەرە سەر. |
| Tension pneumothorax | ڕاستەوخۆ ئەنجامدانی Needle decompression بۆ کەمکردنەوەی پەستانبلەسەر سییەکان وە پێدانی ئۆکسجین و فلود لە ڕێگەی IVایەوە(بڕوانە لێهاتوویەکان)،هەر نەخۆشێک کە Needle decompression ی بۆ ئەنجامدراوە ڕاستەوخۆ بەپەلە پێویستە بگوازرێتەوە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتوو چونکە پێویست دەکات chest tube بۆ دابنرێت. |
| Pericardial temponade | فلودی لە ڕێگەی IV یەوە پێویستە پێ بدرێت بۆ یارمەتیدانی پڕبونەوەی دڵ بۆ ئەوەی بتوانێت کۆنتراکشن بکات و خوێن بۆ جەستە بنێرێت لە ژێر ئەو فشارەی کە بەهۆی کۆبونەوەی ئاو لە پەردەی دەوریدا دروست بووە(بڕوانە لێهاتوویەکان)، ڕاستەوخۆ بەپەلە پێویستە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکرێت بۆ یەکەیەک کە تواناى دەرهێنانی ئەو شلەیەی هەبێت کە لە دەوری دڵدا کۆبۆتەوە. |
| Suspected heart attack | ئەسپرینی پێ بدە ئەگەر پێویستی کرد،کانولەی بۆ دابنێ و شلەی لە ڕێگەی ivایەوە پێ بدە، بەردەوام چاودێری نەخۆشەکە بکە بە وردی و لەنزیکەوە ، لەکاتێکدا ئێستا پێدانی ئۆکسجین بە هەموو ئەو نەخۆشانەی کە توشی جەڵدەی دڵ دەبن پێویست نیەو پێشنیار ناکرێت، بەڵکو بە گوێرەی ئەولەیوت بۆ ئەو نەخۆشانەیە کە شۆکن یان کێشەی هەناسەدانیان هەیەو بە زەحمەت تواناى هەناسەدانیان هەیە .<br>کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بەپەلە بکە. |
| Heart failure | پێویستە ئەو شلەیەی لە ڕێگەیIV یەوە پێی دەدرێت بە هێواشی بچێتە جەستەیەوە، چاودێری سییەکانی بکەو پشکنین بکە بۆ دەنگی crackle کە نیشانەی(Fluid overload) ە ، ڕاستەوخۆ پێویستە فلودەکە ڕابگرین ئەگەر هەر نیشانەیەکی fluid overload هەبوو وەک(زەحمەتی لە هەناسەدان، دەنگی , crackle زیادبوونی لێدانی دڵ و زیادبوونی هەناسەدان) (بڕوانە کارامەییەکان).<br>ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بەپەلەی بکە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتوو. |
| Severe allergic reaction | لە ڕێگەی ماسولکەوە ئەدرینالینی پێویستە پێ بدە(بڕوانە لێهاتوویەکان)،ئەم نەخۆشانە پێویستە کانولەیان بۆ دابنرێت و شلەیان لە ڕێگەی IVیەوە پێ بدرێت و بە وردی چاودێری بکرێن چونکە ئەگەری هەیە وەڵامدانەوەی هەستیارییەکە دووبارە بێتەو ئەوکاتەی ئەدرینالینەکە کاریگەری نامێنێت ،هەندێک جار پێویست دەکات دۆزەکەی بۆ دووبارە بکرێتەوە،ئەگەر بۆری هەوا توشی ئاوساویی بوو یان هور کێشەیەک لە هەناسەدانی دروستبوو ڕاستەوخۆ بەپەلە کار بۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکە بۆ نەخۆشخانە. |

| Traumatic injury or rapid blood loss suspected | خوێن بەربونەکە ڕابگرە،لە ڕێگەی IVیەوە فلودی پێ بدە،وە هەڵسەنگاندنی بۆ بکە(بڕوانە لێهاتوویەکان)،ڕەوانەی بکە بۆ گواستنەوەی خوێن و چاودێری بەردەوامی پزیشکی لە یەکەیەکی پێشکەوتوو. |
|---|---|

# SPECIAL CONSIDERATIONS IN CHILDREN

شۆک دەتوانێت بە شێوەیەکی زۆر خێرا لە منداڵاندا ڕووبدات و مەترسی لەسەر ژیانی دروست دەکات. منداڵان ڕووبەرێکی تاڕادەیەک گەورەتریان هەیە (بە بەراورد لەگەڵ قەبارەی جەستەیان) و بەم شێوەیە ئەگەری زۆرە خێراتر جەستەیان تووشی وشکبونەوە ببێت کۆرپە و منداڵانی بچووک بە تایبەتی مەترسییان لەسەرە چونکە ناتوانن بڵێن کەی تینوویانە و ناتوانن بە تەنیا ئاو بخۆنەوە.

هەڵسەنگاندنی شۆک لە منداڵاندا: پێناسەی کلینیکی بۆ شۆک لە منداڵاندا جیاوازە. ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بۆ چاودێریکردنی منداڵانی توشبوو بە نەخۆشی سەخت لە ساڵی ٢٠١٦دا بوونی سێ تایبەتمەندی کلینیکی بەکاردەهێنن: پەلەکانیی سارد بێت، پڕکردنەوەی موولوولەکان یان کاپیلەری ڕیفیل زیاتر لە ٣ چرکەبێت، و پەستانی خوێن یان پەڵسیان لاواز و خێرایە. هەروەها نیشانە گرنگەکانی تری خراپی پەرفیوژنیان هەیە، لەوانە دابەزینی پەستانی خوێن، هەناسەدانی خێرا، گۆڕانی باری دەروونی و کەمبوونەوەی میزکردن (هەمیشە لە دایک و باوک بپرسە کە منداڵەکە چەند میز دەکات). (بڕوانە لێهاتوویەکان)

نیشانەکانی وشکبونەوە( Dehydration)ی لەش لە منداڵاندا:

- زۆر وشکبوونی دەم و لێو
- بێهێزی (خەواڵوویی زۆر و خاوبوونەوە لە وەڵامدانەوە)، منداڵ زۆر جوڵەی نیە واتە child mot intercative
- Sunken eye
- بڕێکی کەم لە میز ڕەنگەکەی تاریک بێت (پرسیار بکە دەربارەی ژمارەی داییبەکانی کە بۆی گۆڕێوە لە کۆرپە)
- Sunken fontanellesلە کۆرپەی خوار تەمەنی 1 ساڵدا
- دواکەوتنی پڕکردنەوەی موولوولەکان (پڕکردنەوەی ئاسایی موولوولەکان کەمترە لە ٣ چرکە( بڕوانە لێهاتووییەکان).
- Abnormal skin pinch
- Pallor (کەمخوێنی وا دەکات وشکبوونەوەی لەش ڕووبدات و چارەسەرکردن قورستر دەکات (بڕوانە لێهاتووییەکان)



Abnormal skin pinch in a child

هۆکارە باوەکانی شۆک و وشکبونەوەی لەش لە منداڵاندا بریتین لە:

- ڕشانەوە و سکچوون: هەوکردنی گەدە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کتوپڕی ڕشانەوە و سکچوون لەگەڵ هەندێک ئازاری سک و تا , بڕێکی زۆر لە سکچوونی ئاوی ڕەنگە پێشنیاری کۆلێرا بکات، و پێویستە ڕاپۆرت بکرێت بۆ دەسەڵاتدارانی تەندروستی

گشتی.

- ڕشانەوە بەبێ سکچوون: ڕشانەوە بەبێ سکچوون یان تا لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ بەرزبوونەوەی فشار لەسەر مێشک (زەبر، وەرەم، ئاوسانی مێشک)، یان گیرانی ڕیخۆڵە گرنگە منداڵەکە پشکنین بۆ نیشانەکانی زەبر( ڕشانەوە کە پەیوەندی بە تاوە هەیە لەوانەیە ئاماژە بە هەوکردن بکات)
- هەوکردنی زۆر: تا دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ زوو توشی وشکبونەوەی لەش بێت جگە لەوەش هەوکردنی زۆر دەبێتە هۆی فراوانبوونی خوێنبەرەکان و خراپتربوونی شۆک.

ڕەچاوکردنی تایبەتی بەڕێوەبردن:

- بەدخۆراکی: منداڵانی بەدخۆراک(Malnourished Children) مەترسی زۆریان لەسەرە بۆ دابەزینی شەکری خوێن و جگە لە شلەمەنی پێویستیان بە شەکر دەبێت ئەگەر هەبووشلەی تایبەتمەند بدە.( بڕوانە لێهاتوییەکان)
- شلەی IV کەمتر و بە هێواشی بدە، و هەر 5 خولەک جارێک سییەکان بپشکنە بۆ بوونی (Fluid overload). ئەگەر Fluid overloadپەرەی سەند (بوونی دەنگی Crackle لە سییەکاندا)، زیادبوونی ڕێژەی هەناسەدان، زیادبوونی لێدانی دڵ شلەی IV بوەستێنە. هەر کە نیشانەکانی خراپی پەرفیوژن باشتر بوون گواستنەوەی شلەکە بگۆڕە بۆ شلەی دەم. ئەم نەخۆشانە پێویستیان بە ڕادەستکردنەوە/گواستنەوەی خێرا هەیە بۆ دابینکەرێکی پێشکەوتوو لە ناوەندێکدا کە توانای گواستنەوەی خوێنی هەبێت.

# DISPOSITION CONSIDERATIONS

- ئەو کەسانەی شۆکیان هەیە دەکرێت زۆر بە زووی خراپتر بێت حاڵەتەکەیان و زوو بمرن دەبێت زۆر بە وردی چاودێرییان بکرێت .
- ئەو نەخۆشانەی شۆکیان هەیە لەوانەیە سەر لێ شێواو بن و دڵەڕاوکێیان زۆر هەبێت دڵنیابە لە سەلامەتی و کۆنترۆڵکردنیان لە کاتی گواستنەوەدا.
- ئەو نەخۆشانەی شۆکیان هەیە زۆرجار دەگوازرێنەوە بۆ یەکەیەک کە توانای گواستنەوەی خوێنی هەبێت یان نەشتەرگەری گشتی یان منداڵبوون. هەمیشە ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ دامەزراوەی وەرگرتن بکە بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لەوەی کە ئەم سەرچاوانەی لە ڕاستیدا لە کاتی گواستنەوەدا بەردەستن.

MULTIPLE CHOICE QUESTIONS

Answer the questions below. Questions and answers will be discussed in the session.

1. A 7-year-old boy has had lethargy, vomiting and diarrhoea for the past 4 days. His vital signs

are: blood pressure 80/40 mmHg, heart rate 140 beats per minute, respiratory rate 18 breaths per minute. The patient vomits when you try to give anything by mouth. What is your most immediate management?

A. Start an IV line and give fluids

B. Continue to attempt oral rehydration

C. Place a nasogastric (NG) tube and hydrate through it

D. Rapidly transfer to a referral hospital

2. You are taking care of a 28-year-old man who was shot in the abdomen. He is lethargic and the vital signs are as follows: blood pressure 80/40 mmHg, heart rate 130 beats per minute, respiratory rate 20 breaths per minute. There is heavy bleeding from the gunshot wound and the abdomen is rigid and tender. What is the first intervention you should give this patient?

A. IV fluids

B. Intraosseous line

C. Surgery

D. Adrenaline

3. A child that presents with sunken eyes, small amounts of dark urine, dry mucous membranes and abnormal skin pinch testing is most likely suffering from:

A. Pneumonia

B. Head injury

C. Dehydration

D. Hypoglycaemia

4. A 60-year-old man states he has been weak and dizzy for the past week. His vital signs are:

blood pressure 90/50 mmHg, heart rate 125 beats per minute, respiratory rate 16 breaths per minute. His skin is cool and pale. He states that his stools have been black for the past 2 days. What is the most likely cause of his shock?

A. Stomach bleeding

B. Abdominal trauma

C. Dehydration

D. Severe infection

5. You are assessing a 23-year-old man who was stabbed in the chest. You expose the chest to find one stab wound in the right chest with minor bleeding. He is complaining of severe difficulty in breathing and there are no lung sounds on the right side. His neck veins are distended and his skin is cool and sweaty. His vital signs are: blood pressure 86/56 mmHg, heart rate 136 beats per minute, respiratory rate 28 breaths per minute. What is your next step?

A. Chest tube placement

B. Needle decompression

C. Blood transfusion

D. Start IV fluids

# Chapter 5:

# Approach to altered mental status

## ئامانجەکان

لە کاتی تەواوکردنی ئەم چاپتەرەدا ئەم زانیاریانەی لای خوارەوە وەردەگریت:

- ناسینیەوەی دۆزینەوە سەرەکییەکانی History کە پێشنیاری هۆکارە جیاوازەکانی گۆڕانی باری دەروونی دەکەن.
- ناسینەوەی دۆزینەوە جەستەییە سەرەکییەکان کە پێشنیاری هۆکارە جیاوازەکانی گۆڕانی باری دەروونی دەکەن.
- هۆکارە مەترسیدارەکانی گۆڕانی باری دەروونی لە گەورەکان و منداڵاندا.
- ئەنجامدانی کردارە گرینگەکان بۆ هۆکارە مەترسیدارەکانی گۆڕانی باری دەروونی.

## تێڕوانینی گشتی

گۆڕانی باری دەروونی (AMS) زاراوەیەکە بۆ کۆمەڵێک شت بەکاردێت، لە گۆڕانکاری لەناکاو یان وردە لە ڕەفتاری کەسەکەدا تا دەگاتە Disorientation وسەرلێشێواوی و کۆما.

گۆڕانکاری لە باری دەروونی و/یان ئاستی هۆشیاری لەوانەیە بەهۆی ئەو حاڵەتانە بێت کە کاریگەرییان لەسەر مێشک هەیە (وەک کەمی ئۆکسجین یان گلوکۆز, یان شۆک کە دەبێتە هۆی کەمی پەرفیوژن) یان کێشەی مێشک خۆی (وەک هەوکردن، وەڵامدانەوەی هەوکردن یان بریندداربوون). لە کاتێکدا کێشە درێژخایەنەکانی دەروونی و خەمۆکی دەتوانن ببنە هۆی گۆڕانکاری لە باری دەروونی، گۆڕانی باری دەروونی زۆرجار ئاماژەیە بۆ نەخۆشی توند، و مەترسییەکانی دیکەی ژیان.هەمیشە دەبێت هۆکارەکان لەبەرچاو بگیرێن( بوونی هێڵنجدان , دۆخێکی خێرا و گۆڕانی سەرلێشێواوی لەگەڵ وروژان ، لەدەستدانی فۆکەس و بێتوانایی لە intract ێکی گونجاو ) هەمیشە پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی تەواو هەیە. هەمیشە پرسیار لە خێزان/هاوڕێکان بکە دەربارەی باری دەروونی بنەڕەتی واتە بەیس لاین.

ئامانجی هەڵسەنگاندنی سەرەتایی( INTIAL ASSESSMENT)دەستنیشانکردنی هۆکارە خێراکانی گۆڕانی باری دەروونییە، و ناسینەوەی بارودۆخە مەترسیدارەکان کە پێویستیان بە گواستنەوە هەیە.
ئامانجی (ACUTE MANAGEMENT) دڵنیابوونە لەوەی کە خوێن و ئۆکسجین و گلوکۆز دەگەنە مێشک, و بۆ پاراستنی مێشک لە بریندداربوونی زیاتر.

### بیرهاتنەوە...

- هەمیشە بە ڕێبازی ABCDE دەست پێ بکە، بەپێی پێویست دەستوەردان بکە.
- پاشان SAMPLE HISTORY ئەنجام بدە.
- پاشان SECONDARY EXAM ئەنجام بدە.

# ABCDE: KEY ELEMENTS FOR ALTERED MENTAL STATUS

بۆ ئەو کەسەی کە باری دەروونی گۆڕاوە، ئەمانەی خوارەوە توخمە سەرەکییەکانن کە پێویستە لە ڕێبازی ABCDEدا لەبەرچاو بگیرێن.

| | |
|---|---|
| **AIRWAY** | ئەو کەسانەی باری دەروونییان گۆڕاوە لەوانەیە نەتوانن بۆری هەناسەیان بپارێزن و لەوانەیە مەترسی خنکاندنیان لەسەر بێت بەهۆی ڕشانەوە. |
| **BREATHING** | هایپۆکسیا (کەمی ئۆکسجین) دەکرێت هۆکارێک بێت بۆ گۆڕینی باری دەروونی. بگەڕێ بەدوای هەر نیشانەیەکی سەختی هەناسەدان، یان سیانۆس ( شین بونەوەی لە پێست). هەناسەدانی نائاسایی دەکرێت ڕەنگدانەوەی Diabetic Ketoacidosis یان ژەهراویبوون بێت. |
| **CIRCULATION** | کەمی پەرفیوژن بۆ مێشک دەبێتە هۆی گۆڕانی باری دەروونی ، بۆیە بەدوای نیشانەکانی شۆکدا بگەڕێ و دەستێوەردانی خێرای بۆ بکە لەوانە (نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، بەرزبوونەوەی لێدانی دڵ، دواکەوتنی پڕبوونەوەی موولوولەکان واتە کاپیلەری ڕیفیڵ). |
| **DISABLITY** | (GCS,AVPU) پشکنین ئەنجام بدە (لە زەبردا GCS ). ڕێژەی گلوکۆز بزانە بگەڕێ بە دواى (کەمبوونەوەی شەکری خوێن یان بەرزبوونەوەی شەکرە دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕانکاری لە باری دەروونیدا)<br>.ئەو کەسانەی بیلبیلەی چاویان زۆر بچووک بۆتەوە پێشنیاری ئەوەمان بۆ دەکەن کە دەکرێت کەسەکە زیادەڕۆیی لە ژەمی ئۆپیۆید کردبێت یان ژەهراویبوون ڕوویدابێت (بیر لە pesticide بکەرەوە). ئەو کەسانەشی بیلبیلەی چاویان زۆر فراوانبووە پێشنیاری بەکارهێنانی دەرمانی هاندەرمان بۆ دەکەن واتە ( Stimulant drug)ەکان. بیلبیلەی چاوەکان ئەگەر نایەکسان بوو واتە unequal پێشنیاری زیادبوونی فشار لەسەر مێشک دەکەن. ئەگەر نەخۆش توانی ئەو شناه جێبەجێ بکات کە پێی دەڵێیت جێبەجێ بکات، پشکنین بکە( بۆ هێز و هەستکردن لە دەموچاو و قۆڵ و قاچەکان. لاوازی یان لەدەستدانی هەست لە لایەکدا ئاماژەیە بۆ بوونی ( mass)، خوێنبەربوون، یان گیرانی خوێنبەرەکانی مێشک (جەڵتەی مێشک)، هەرچەندە دابەزینی شەکری خوێنیش دەتوانێت بەم شێوەیە دەربکەوێت. گۆڕانی باری دەروونی لەگەڵ لاوازی ماسولکەکان بە گشتی لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ ناهاوسەنگی خوێ (ئەلکترۆلایت) لە خوێندا. بەدوای جوڵەی نائاسایی دووبارەبووەوە یان لەرزین لە لایەک یان هەردوو لا لە جەستەدا بگەڕێ (گەشکە) — ئەمە لەوانەیە بەهۆی (وەرەم، خوێنبەربوون، هەوکردنی مێشک، دابەزینی شەکری خوێن، یان ناهاوسەنگی خوێ (ئەلکترۆلایت) )بێت. |
| **EXPOSURE** | لەبیرت بێت کە ئەو نەخۆشانەی کە باری دەروونییان گۆڕاوە لەوانەیە مێژووی خۆیان بە وردی ڕاپۆرت نەکەن. پشکنینی هەموو جەستە بۆ هەوکردن و پەڵە و هەر بەڵگەیەک لەسەر زەبر و گازگرتن یان چەقۆ ئەنجامبدە. ڕەنگە نیشانەی دەرزی لەسەر قۆڵەکان ئاماژە بە وەرگرتنی دەرمانەکان بکات . |

# ASK: KEY HISTORY FINDINGS FOR PATIENTS WITH ALTERED MENTAL STATE

ڕێبازی SAMPLE بەکاربهێنە بۆ بەدەستهێنانی مێژوو لە نەخۆشەکە و/یان خێزانەکە. گرنگە مێژوویەک لە تەماشاکەران، هاوڕێیان یان خێزانەکە وەربگریت چونکە ڕەنگە بەدەستهێنانی مێژووی ورد لە نەخۆشێکی سەرلێشێواو قورس بێت. بۆ نموونە کەسێک کە دابەزینی شەکری خوێنی هەیە، ڕەنگە زۆر سەر لێ شێواو بێت و نەتوانێت مێژووی نەخۆشی شەکرە بگێڕێتەوە .ئەگەر مێژووەکە بارودۆخێکی ABCDE دەستنیشان بکات، دەستبەجێ بوەستە و بگەڕێوە بۆ ABCDE بۆ بەڕێوەبردنی حاڵەتەکە.

- S:sign and symptoms

چۆن بارودۆخی ئێستا بەراورد دەکرێت بە باری دەروونی بنەڕەتی؟

هەمیشە پرسیار لە خێزان/هاوڕێکان بکە دەربارەی باری دەروونی بنەڕەتی کاتێک کە دەتوانرێت.

ئایا کێشەی هەناسەدان هەیە؟

گۆڕانی باری دەروونی کە پەیوەندی بە سەختی هەناسەدانەوە هەیە، لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ کەمی ئۆکسجین بۆ مێشک.

ئایا سەرئێشە هەیە؟

سەرئێشە لەگەڵ گۆڕانی باری دەروونی دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ هەوکردن، وەرەم یان خوێنبەربوون.

ئایا ڕشانەوە/سکچوون هەیە؟

ڕشانەوە بەبێ سکچوون دەتوانێت نیشانەی زیادبوونی فشار بێت لە مێشکدا. هەر سەرچاوەیەکی وشکبوونەوەی لەش، لەوانەش ڕشانەوە و سکچوون، لەوانەیە ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی بەهۆی خراپی پەرفیوژن. هەروەها ڕشانەوە و سکچوون دەبێتە هۆی دابەزینی شەکری خوێن کە دەبێتە هۆی گۆڕینی دەروونی

دۆخ.

ئایا هیچ سەرگێژخواردنێک یان بێهۆشبوونێک هەبووە؟

لەوانەیە ئەمانە نیشانەکانی خراپی پەرفیوژن (کەمی خوێنی ئۆکسجین) بن بۆ مێشک.

نیشانەکان کەی دەستیان پێکرد؟ دێن و دەڕۆن؟ تا چەند دەمێننەوە؟ ئایا بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە؟

سەرەتای خێرای گۆڕانی باری دەروونی لەوانەیە پێشنیاری هەوکردن، وەڵامدانەوەی هەوکردن، خوێنبەربوون یان بەرکەوتنی کەسەکە بە دەرمان/ ژەهراویبوون بکات. سەرهەڵدانی وردە وردە (لە ماوەی چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێکدا) لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ (Spaceoccupying lession) لە مێشکدا، وەکو وەرەمێک یان خوێنبەربوونی هێواش لە مێشکدا. گۆڕانی باری دەروونی کە لەگەڵ ماوەی ئاسایی نێوان ئێپسۆدەکان دێت و دەڕوات، لەوانەیە هۆکاری دیکە پێشنیار بکات، وەک گەشکە یان نەخۆشی دەروونی.

ئایا لەم دواییانەدا تا هەبووە؟

هەر کەسێک باری دەروونی گۆڕاو و تای هەبێت لەوانەیە تووشی هەوکردن بێت. زۆرجار هەوکردنی مێشک لەگەڵ گۆڕانی باری دەروونی و تادا دەردەکەوێت. لە منداڵی بچووک و بەساڵاچوودا، هەر هەوکردنێکی قورس، وەک هەوکردنی میز، سییەکان، یان خوێن دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.

هەروەها بەرکەوتنی درێژخایەن لە دەرەوە، ژەهراویبوون، دەرمان لەبەرچاو بگرە چونکە ئەمانە لەوانەیە لەگەڵ تادا دەربکەون. تا زۆر بەرز بێت لە هەر سەرچاوەیەکەوە ڕەنگە ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.

ئایا هیچ لاوازی و یان سەختی لە ڕۆیشتنی نەخۆشەکە هەیە؟

گۆڕانی باری دەروونی لەگەڵ لاوازی یان لەدەستدانی هەستەوەرەکان لە ناوچەیەکی جەستەدا، یان کێشەی ڕۆیشتن و هاوسەنگی، ئەوە پیشان دەدات کە گۆڕانی باری دەروونی لە هۆکارێکەوە سەرچاوەی گرتووە لە خودی مێشکدا، وەک جەڵتەی مێشک یان وەرەم.

ئازاری مل یان ڕەقبوونی هەیە؟

هەروەها ئەو شلەیەی کە بە دەوری مێشکدا دەسوڕێتەوە و بە دەوری بڕبڕەی پشتدا دەسوڕێتەوە، واتە هەر خوێنبەربوون، هەوکردن یان هەوکردنێک لە مێشکدا (هەوکردنی پەردەی مێشک، هەوکردنی مێشک) بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی ئازاری مل و ڕەقبوونی.

ئایا مێژوویەکی ئەم دواییەی زەبر یان کەوتن هەیە؟

خوێنبەربوون لەناو مێشک یان دەوروبەری مێشک دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی لەوانەیە چەند ڕۆژێک لە دوای بریندابوون ئەمە ڕوودات.

لەبیرت بێت ئەو کەسانەی کە کحول دەخۆنەوە بۆ ماوەیەکی درێژ و کەسانی بەساڵاچوو زیاتر تووشی خوێنبەربوونی مێشک دەبن و لەوانەیە کەوتنیان لەبیر نەبێت. هەمیشە خوێنبەربوونی هێواش لە دەوری مێشک وەک هۆکارێک لەبەرچاو بگرە، تەنانەت چەند ڕۆژێک دوای کەوتن، هەروەها زەبری بێ شایەتحاڵ لە نەخۆشێکدا کە دەدۆزرێتەوە لەبەرچاو بگرە.

کە باری دەروونی گۆڕاوە بەبێ هیچ هۆکارێکی ناسراو.

ئایا لەم دواییانەدا هیچ خەمۆکییەک یان گۆڕانکاری لە ڕەفتاردا ڕوویداوە؟

**بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و کحولەکان یان کێشەی دەروونی دەتوانن وەک گۆڕانی باری دەروونی خۆیان نیشان بدەن. هەمیشە ئەگەری هەوڵی خۆکوشتن بە ژەهراویکردن لەبەرچاو بگرە.**

**ئایا کەسێکی تر لە هەمان خێزان یان شوێن نیشانەکانی هەیە؟**

**ژەهراویبوونی گازی، وەک ژەهراویبوونی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن، دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی لە چەند کەسێکدا. ژەهراویبوونی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن بەزۆری لە کەشوهەوای سارددا دەبینرێت کاتێک مرۆڤەکان گەرمکەرەوەی ناوماڵ بەکاردەهێنن.**

- A:allergy

**هیچ هەستیارییەک یان بەرکەوتنێکی ئەم دواییە بە مادەییەک کە کەسەکە هەستیاریی پێی هەبێت و ناسراو بێت هەبووە؟**

**کاردانەوەی هەستیاری توند (ئەنافیلاکسی) لەوانەیە لەگەڵ گۆڕانی باری دەروونیدا دەربکەوێت بەهۆی دابەزینی ئاستی ئۆکسجینی خوێن یان خراپی سووڕی خوێن بۆ مێشک لە ئەنجامی شۆک.**

- M:medication

**لە ئێستادا هیچ دەرمانێک دەخوات؟**

**زۆرێک لە دەرمانە باوەکان دەتوانن ببنە هۆی گۆڕینی باری دەروونی وەک کاریگەری لاوەکی، لەوانە ئەوانەی بۆ گەشکە بەکاردێن، ئازار و خەوتن. پرسیار بکە دەربارەی دەرمانە نوێیەکان و گۆڕینی ژەمە دەرمانەکان، و کارلێکەکانی دەرمانەکان لەبەرچاو بگرە. پێویستە لیستی دەرمانەکان کۆبکرێتەوە و دەتوانێت ئاماژە بۆ نەخۆشییە بنەڕەتییەکان (وەک گەشکە، نەخۆشی جگەر، شەکرە) دابین بکات ئەگەر کەسەکە نەتوانێت پەیوەندی بکات. دەرمانی ئۆپیۆید (وەک مۆرفین، پێتیدین و هێرۆین) دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.**

P:past medical history

**مێژووی نەخۆشی شەکرە؟**

**لە هەر نەخۆشێکی نەخۆشی شەکرە و گۆڕانی باری دەروونی، گومان لە**Diabetic crisis **، یان دابەزینی شەکری خوێن کە بەهۆی دەرمانەکانەوە دروست دەبێت بکە. زیادبوونی میز لەم دواییانەدا، زیادبوونی تینوێتی، و هەناسەدانی خێرا یان قووڵ پێشنیاری** Diabetic crisis **کیتۆئەسیدۆزی شەکرە**

**مێژووی نەخۆشی دڵ؟**

**جەڵتەی دڵ دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕۆیشتنی خوێن و ئۆکسجین بۆ مێشک کە دەبێتە هۆی سەرلێشێواوی. هەروەها ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە ئەگەری تووشبوونیان بە جەڵتەی مێشک زیاترە.**

**مێژووی جەڵتەی مێشک؟**

**گۆڕانی باری دەروونی لە نەخۆشێکدا کە پێشینەی جەڵتەی مێشکی هەبووە، لەوانەیە پێشنیاری جەڵتەی مێشکی زیادە یان خوێنبەربوون لە مێشکدا بکات. دڵنیابە پرسیار لەو کەسانە بکە کە نەخۆشەکە دەناسن دەربارەی دۆخی ئاسایی دەروونی و دەمارەکانی. نیشانەکانی جەڵتەی مێشکی کۆن لەوانەیە لەگەڵ نەخۆشییەکی سەخت بە هەر جۆرێکدا بگەڕێتەوە.**

**مێژووی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن؟**

**بەرزی پەستانی خوێن ئەگەری خوێنبەربوون لە ناو مێشک و دەوروبەری مێشک زیاد دەکات (وەک جەڵتەی مێشک).**

**مێژووی گەشکە؟**

**گۆڕانی باری دەروونی لە نەخۆشێکدا کە پێشینەی گەشکە هەیە لەوانەیە ئەوە پیشان بدات کە نەخۆشەکە گەشکەی هەیە یان چاک دەبێتەوە. پرسیار بکە دەربارەی دەرمانی ئاسایی و هەر گۆڕانکارییەکی ئەم دواییەی ژەمە دەرمانەکە یان ژەمە لەدەستچووەکان. لەگەڵ گەشکەی شایەتحاڵدا، پرسیار بکە دەربارەی کەوتن یان زەبری سەر. هەمیشە بپرسە ئایا گەشکەکە وەک یەک بووە یان جیاواز بووە بە بەراورد بە پێشوو. لەبیرت بێت دۆزخی ئاسایی یان چاکبونەوە**

**دوای گەشکە بەزۆری تەنها نیو کاتژمێر بۆ چەند کاتژمێرێک دەخایەنێت بەزۆریی، هەرچەندە نەخۆشەکان ڕەنگە هەست بە ماندووبوون بکەن بۆ ماوەیەکی زیاتر. گۆڕانی درێژخایەنی باری دەروونی پێشنیاری ئەوە دەکات**

**هۆکارێکی ترهەیە.**

**مێژووی تووشبوون بە ئایدز؟**

**گۆڕانی باری دەروونی لە کەسێکی تووشبوو بە HIV لەوانەیە پێشنیاری هەوکردن بکات لە مێشکدا یان دەوروبەری (هەوکردنی پەردەی مێشک، هەوکردنی مێشک)**

**مێژووی نەخۆشی سیل؟**

**نەخۆشی سیل دەتوانێت مێشک تووش بکات و ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.**

**مێژووی لەکارکەوتنی جگەر یان گورچیلە؟**

**لەکارکەوتنی جگەر یان گورچیلە دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشە لە پاککردنەوەی ژەهر و پاشماوەکان لە خوێندا، ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.**

**مێژووی بەکارهێنانی کحولی زۆر؟**

**سەرخۆشی بە کحول و وازهێنان لە کحول دەتوانێت لەگەڵ گۆڕانی باری دەروونیدا دەرکەوێت. هەروەها ئەو کەسانەی کە پێشینەی بەکارهێنانی کحولی زۆریان هەبووە، مەترسی زۆریان هەیە بۆ برینداربوونی سەر (و لەوانەیە کەوتنیان لەبیر نەبێت) و دابەزینی شەکری خوێن، کە هەردووکیان دەبنە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.**

**بەکارهێنانی مادەی هۆشبەری یان خراپ بەکارهێنان؟**

**چەندین دەرمانی خراپ بەکارهێنان دەبنە هۆی گۆڕینی باری دەروونی، لەوانە هاندەر، هێورکەرەوە و دەرمانی ئۆپیۆید.**

**مێژووی دووگیانی؟**

**بەرزی پەستانی خوێن لە کاتی دووگیانیدا دەبێتە هۆی تووشبوون بە ئیکلەمپسیا (یان گەشکە و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن) لە کاتی دووگیانیدا.**

- L:last oral intake

**دوایین جار کەسەکە کەی خواردویەتی خواردوویەتیەوە؟**

**دابەزینی ئاستی گلوکۆزی خوێن و وشکبوونەوەی لەش دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.**

- E:event surrounding illnesses

**بەرکەوتنی زەبر ئەم دواییە؟**

**هەردوو بریندداربوونی سەر و خراپی پەرفیوژن کە لە ئەنجامی لەدەستدانی خوێنەوە دروست دەبێت، دەبنە هۆی گۆڕینی باری دەروونی.**

**گەشتکردنی ئەم دواییە بۆ ئەو ناوچانەی کە ڕەنگە هەندێک جۆری هەوکردن زیاتر باو بێت؟**

**هەوکردنی تایبەت کە دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی لەوانەیە لە هەندێک ناوچەدا زیاتر باو بێت. مەلاریا لە زۆر بواردا ڕەچاوکردنی سەرەکییە.**

**بەرکەوتنی ئەم دواییە: بەرکەوتن لەگەڵ کەسێکی نەخۆش، پێوەدانی ئەم دواییە، بەرکەوتنی مادده کیمیاییەکان، ژینگەی گەرم یان سارد و هتد؟**

**بەرکەوتنی نەخۆش لەوانەیە هۆکاری تووشبوون پیشان بدات. بەرکەوتنی کیمیایی (وەک** pesticide **) یان گازگرتن لەوانەیە پێشنیاری سەرخۆشبوون یان ژەهراویبوون بکات. گۆڕانی باری دەروونی دەتوانێت بەهۆی هەردووکیانەوە بێت**

**پلەی گەرمی لەش زۆر نزم و زۆر بەرز بێت.**

**بەکارهێنانی کحول یان مادەی هۆشبەر بەم دواییە؟**

**هەردوو سەرخۆشی کحول و واز هێنان لە کحول دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی. میتامفیتامین و کۆکاین لەوانەیە ببنە هۆی** Agitation**ی توند، لە کاتێکدا هێرۆین (و دەرمانی ئۆپیۆیدەکانی تر) لەوانەیە ببنە هۆی بێهێزی و کۆما.**

## CHECK: SECONDARY EXAMINATION FINDINGS IN ALTERED

## MENTAL STATUSCHECK: SECONDARY EXAMINATION FINDINGS IN ALTERED MENTAL STATUE

لەوانەیە کەسێک کە باری دەروونی گۆڕاوە نەتوانێت وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە و ئاماژەکان بۆ هۆکارەکەی تەنها لە کاتی پشکنینی جەستەیی دەتوانرێت بدۆزرێتەوە. هەموو کات سەرەتا هەڵسەنگاندن بۆ ABCDE بکە. ڕێبازی سەرەتایی ABCDE حاڵەتە مەترسیدارەکان بۆ سەر ژیان دەستنیشان دەکات و بەڕێوەیان دەبات .

دواتر لە Secondary examination بەدوای گۆڕانکاری لە بارودۆخی نەخۆشەکەدا دەگەڕێت یان هۆکارە کەمتر دیارەکان کە لەوانەیە لە کاتیABCDE دا لەدەستچووبن دیاری دەکات. ئەگەر Secondary examination ەکە حاڵەتێکی ABCDE دەستنیشان کرد، بوەستەو  و دەستبەجێ بگەڕێنەوە بۆ ABCDE بۆ بەڕێوەبردنی.

### پشکنین بۆ سەلامەتی:

ڕەفتاری وروژێنەر و توندوتیژی لەلایەن نەخۆشەکەوە شتێکی باو و ئاساییە. زۆر گرنگە  بتوانرێت هۆکاری بنەڕەتی دەستنیشان بکرێت و چارەسەر بکرێت، لە هەمان کاتدا سەلامەتی نەخۆش و دابینکەران لە پێشینەدا بێت. ئارام بگرن و وەک یەک تیم کار بکەن. دڵنیابە لەوەی کە شوێنەکە سەلامەتە لە  چەک و دڵنیابە لەوەی نەخۆشەکە لە نێوان تۆ و دەرگاکەدا نییە. دوور بکەوەرەوە لەوەی نەخۆش هەست بە هەڕەشە بکات. زۆر نزیک دابنیشن و بە دەنگێکی هێمن و نەرم و هاوسۆزی قسە مەکەن. بەردەوام ڕوونی بکەرەوە کە چی ڕوودەدات بۆیە  پەیوەندی بکەن بۆ یارمەتی و ئەگەر پێویست بوو وەک گرووپێک لە نەخۆشێک نزیک ببنەوە. نیشانە گرنگەکان بپشکنە، لەوانە  پلەی گەرمی و گلوکۆز، و چارەسەری نائاساییەکان بکە. زوو پەیوەندی بکەن بۆ یارمەتی و کار بۆ ڕێکخستنی ڕادەستکردنەوە/گواستنەوە بۆ دابینکەرێکی  پێشکەوتوو بکە.

پشکنین و چاودێری ئاستی هۆشیاری بە  پێوەرەکەی:AVPU

Alertئاگادارکردنەوە

Response to voiceوەڵامی دەنگ دەداتەوە

Response to Painوەڵامی ئازار دەداتەوە

Unresponsive وەڵامدانەوەی نییە

AVPUتوانای کەسەکە تاقیدەکاتەوە بۆ وەڵامدانەوەی هاندەرەکان. ئەو کەسەی سەرخۆش نەبووە و هیچ نەخۆشی و برینێکی نییە کە کاریگەری لەسەر مێشک هەبێت، بەزۆری بەبێ ئەوەی هان بدرێت، ئاگادار دەبێتەوە. ئەو نەخۆشانەی کە تەنها کاتێک وەڵام دەدەنەوە کە دەنگ یان ئازار هانیان دەدات،  پێویستیان بە هەڵسەنگاندنی زیاتری سیستەمی دەمار هەیە بڕوانە

لە  زەبردا،  پێوەرەکانی گلاسکۆ کۆما سکەیڵ بپشکنە:

پێوەرەکانی گلاسکۆ کۆما سکەیڵ بپشکنە و چاودێری بکە.

پشکنینی ئاستی گلوکۆزی خوێن:

دابەزینی شەکری خوێن دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی. کیتۆئەسیدۆزی شەکرە دەتوانێت لەگەڵ بەرزبوونەوەی شەکری خوێن و گۆڕانی باری دەروونیدا دەرکەوێت.

پشکنینی بیلبیلەی چاو:

زۆر بچووکی بیلبیلە و هەناسەدانی خاو پێشنیاری زیادەڕۆیی لە ژەمی ئۆپیۆید دەکات.

بیلبیلەی زۆر گەورە (فراوان) پێشنیاری بەکارهێنانی دەرمانی هاندەر دەکەن. بیلبیلەکانی چاوی ئەگەر نایەکسانەکان بوون پێشنیاری زیادبوونی فشار لەسەر مێشک دەکەن.

پشکنین بۆ: orientation

ئەگەر نەخۆشەکە وریا بوو و وەڵامی دەنگی دایەوە، پرسیاری سادە بکە (بۆ نموونە: ناوت چییە؟ لە کوێیت؟ کاتژمێر چەندە؟ چ ڕۆژێکی هەفتەیە؟).

پشکنین بۆ زەبر:

هەر نەخۆشێک کە گۆڕانی باری دەروونی و مێژووی یان بەڵگەی زەبری هەبێت، پێویستە بە ئەگەری برینداربوونی سەری هەژمار بکرێت – تەنانەت ئەگەر زەبرەکە چەند ڕۆژێک پێشتر ڕوویدابێت.

سوربونەوەی دەوری چاوەکان، پشت گوێچکەکان، یان دزەکردنی شلەی ڕوون لە لووت یان گوێچکەکانەوە ئاماژەیە بۆ برینداربوونی سەر لەگەڵ شکانی کەللەسەر.

پشکنینی پلەی گەرمی:

تا دەبێت نیگەرانییەکان لەسەر هۆکارێکی تووشبوو دروست بکات، تا لەگەڵ ڕەقبوونی ملدا ئاماژەیە بۆ هەوکردن لەناو مێشک یان دەوروبەری. ژەهراویبوون، زیادەڕۆیی لە دەرمان،وازهێنان لە کحول

و گۆڕانکاری لە هۆرمۆنەکانی جەستەدا دەتوانێت لەگەڵ بوونی تا دا دەرکەوێت. کەمی گەرمی لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ هەوکردن، دابەزینی ئاستی هۆرمۆنەکانی جەستە (بۆ نموونە، تایرۆید) یان بەرکەوتن بە ژینگەی تەڕ یان سارد.

پشکنین بۆ ڕەقبوونی مل (لەبیرت بێت، ئەگەر گومانت لە زەبر هەبوو، مل مەجوڵێنە).

ڕەقبوونی مل ئاماژەیە بۆ هەوکردن (هەوکردنی پەردەی مێشک) یان خوێنبەربوون لە دەوری مێشک. ئەگەر گومانی هەوکردنت هەبوو، هەرکەسێک بەرکەوتەی نەخۆشەکە بوو، پێویستە دەمامک بەکاربهێنێت.

پشکنینی هێز و هەستکردن:

ئەگەر نەخۆش توانی ئەو شتانەی پێی دەوترێ جێبەجێ بکات، پشکنینی هێز و هەستکردن لە دەم و دەست و قاچدا بکە. لاوازی یان لەدەستدانی هەست لە لایەکدا ئاماژەیە بۆ بوونیmass ، خوێنبەربوون یان گیرانی خوێنبەرەکان لە مێشکدا (جەڵتەی مێشک)، هەرچەندە دابەزینی شەکری خوێنیش دەتوانێت بەم شێوەیە دەربکەوێت. گۆڕانی دۆخی دەروونی لەگەڵ لاوازی ماسولکەکانی بە گشتی لەوانەیە پێشنیاری ناهاوسەنگی خوێ (ئەلکترۆلایت) لە خوێندا بکات.

پشکنین بۆ نیشانەکانی وشکبونەوەی لەش:

وشکبونەوەی لەش دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی. پشکنینی وشکبوونەوەی دەم وskin pinchی نائاسایی پێست. هەروەها وشکبونەوەی جەستە ڕەنگە پێشنیاری کیتۆئەسیدۆزی شەکرە بکات.

**پشکنینی سک:**

**هەست بەوە بکەکە جگەر گەورە بووە یان تێندەرە. جگەرێکی هەستپێکراو یان تێندەرنێس پێشنیاری نەخۆشی جگەر دەکات.**

**پشکنینی پێست:**

**پێستی سارد و کاڵ و شێدار ئاماژەیە بۆ شۆک یان دابەزینی شەکری خوێن. زەردبوونی پێست (زەردوویی) ئاماژەیە بۆ نەخۆشی جگەر و سوربونەوە ئاماژەیە بۆ زەبر. پەڵە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ هەوکردنی سیستەمی. پشکنین بکە بۆ گازگرتن و برینی چەقۆ.**

**چاودێری گۆڕانکاری لە باری دەروونی:**

**ئەو کەسانەی کە لە سەرەتادا سەریان لێ شێوا و بە خێرایی دەگەڕێنەوە باری ئاسایی خۆیان بەبێ چارەسەر لەوانەیە تووشی گەشکە یان زەبری سەریان بووبێت. ئەو کەسانەی کە باری دەروونییان گۆڕاوە پێویستیان بە چاودێری ورد هەیە بۆ ئەوەی دڵنیابن کە جارێکی دیکە خراپتر نابنەوە. (ئەمە دەتوانێت لەو نەخۆشانەدا ڕووبدات کە شەکری خوێنیان کەمە یان زەبر بەر سەریان کەوتوە).**

# POSSIBLE CAUSES OF ALTERED MENTAL STATUS

## RAPIDLY REVERSIBLE CAUSES

| بارودۆخ | نیشانەکانی |
|---|---|
| Hypoglycaemia | ئارەقکردنەوەی زیاد لە پێویست(diaphorisis)<br>گەشکە<br>ڕێژەی شەکر لە ناو خوێن<3.5mmol/L<br>مێژووی نەخۆشیەکانی(شەکرە،مەلاریا،نەخۆشی قورسی دیکەی هەبێت کەسەکە بەتایبەت لە منداڵاندا).<br>باری دەروونی زۆر بە زووی گۆڕانکاری بەسەردا دێت و بەرەو باشتر بوون دەچێت لەکاتی وەرگرتنی گلوکۆز. |
| Severe dehydration | نیشانەکانی کەمی پێرفوژن<br>Abnormal skin pinch<br>نەخۆشەکە توانای کەم دەبێتەوە بۆ خواردن و خواردنەوە<br>شلەیەکی زۆر لەدەست دەدات<br>Mucos membraneزۆر وشک دەبێت |
| Heat stroke | ماوەیەکی درێژ گەرمی زۆری بەرکەوێت یان لەپێش خۆر بمێنێتەوە<br>پلەی گەرمی جەستە زۆر بەرز بێت ، جەستەی زۆر گەرم بێت،لەوانەیە ئارەقکردنەوەی لەگەڵدا بێت بەڵام مەرج نیە لە هەموو نەخۆشێک هەبێت. |
| Hypoxia | هەناسە کورتی<br>دابەزینی ئۆکسجین لە خوێن<br>شین بونەوە(cyanosis) |

## INFECTION

| بارودۆخ | نیشانەکانی |
|---|---|
| Cerebral malaria | بوونی تا.<br>تێستەکانی پۆزەتیڤ بێ.<br>لە ناوچەیەک بێت مەلاریا تیای بڵاوبێت. |
| Inflammation/infection around the brain (meningitis, encephalitis، brain abscess, bleeding | تا،neck stiffness، پەڵە،ئازاری چاو کاتێک سەیری ڕووناکی دەکات واتە هەستیار دەبێت بەرامبەر ڕووناکی،ئازاری سەر،زانینی ئەوەی نەخۆشیەکە بەربڵاوە لە شوێنەکە،مێژووی نەخۆشی سیل یان ئایدز. |
| Severe infection | تا<br>زیادبوونی لێدانی دڵ<br>زیادبوونی هەناسەدان<br>لەوانەیە پەستانی خوێنی دابەزێت<br>نیشانەکانی هەوکردن(هەوکردنی پێست کە بەچاو ببینرێت،کۆکەو بوونی دەنگی crackle لە لایەکی سییەکاندا زۆربەی جار نەخۆشەکە بە زەحمەت هەناسەی بۆ دەدرێت لەم حاڵەتەدا، وە هەستکردن بە |

| | |
|---|---|
| | سوتانەوە لەکاتی میزکردن، ڕەنگی میزەکەی ڕوون نیە cloudyیە، وە بوونی هەر focal painێک کە تا ی لەگەڵ بێت. |

| METABOLIC | |
|---|---|
| بارودۆخ | نیشانەکانی |
| Diabetic ketoacidosis | مێژووی نەخۆشی شەکرە،هەناسەکورتی و قوڵی هەناسەدان، زوو زوو میزکردن،هەناسەکانی بۆنیان شیرینە،ڕێژەی گلوکۆز لە خوێن یان میزدا زۆر بەرزە،وشکبونەوە |

| TOXIC | |
|---|---|
| بارودۆخ | نیشانەکانی |
| Alcohol or drug intoxication or withdrawal | زانینی ئەوەی کە کەسەکە کهول یان دەرمان بەکاردەهێنێت،ئەگەر کەسەکە دەرمان بەکاربهێنێت دەتوانین شوێنی دەرزی لێدانەکانی سور قوڵی ببینیت<br>بوونی کهول ، بۆنی هەناسەی کەسکە بۆنی کهولی لێدێت reddened face<br>Acutely intoxicated (drunk)<br>دەکرێت نیشانەکانی بەکارنەهێنان یان وازهێنان ئەمانەبن(شلەژان،گەشکە،زیادبوونی لێدانی دڵ)<br>وە نیشانەکانی ئەمانەن لە کەسێک کە بۆ ماوەیەکی درێژە بەکاری دەهێنێت<br>balance problem<br>شلەژان<br>• Opiods<br>ئەگەر کەسەکە ئەو کاتە بەکاری هێنابێت دەکرێت ناسینەوەی لە ڕێگەی ئەم نیشانانەوە بن(بێهێزی،بیلبیلەی چاوی زۆر بچوک دەبێتەوە،وە هەناسەدانیشی زۆر هێواشە)<br>نیشانەکانی وازهێنان( withdrawal)دەکرێت بریتی بن لە<br>ئارەفکردنەوە(Agitation)، سکچون یان ڕشانەوە,<br>دەرمانەکانی دیکە دەکرێت ببنە هۆی گەورەبوونگ بیلبیلەی چاو,Agitationئارەفکردنەوە،تا. |
| Pesticide poisoning | مێژووی بەرکەوتن،بیلبیلەی چاوی زۆر بچوک دەبێتەوە،سکچون،ڕشانەوە،ئارەقکردنەوەی زۆر (diaphorisis) |
| Snake bite | مێژووی پێوەدانی مار، Bite marks in a setting with venomous snakes،ئاوساویی،دروستبوونی بلق لەسەر پێست،سوربونەوە،دابەزینی پەستانیی خوێن،ئیفلیجی،گەشکە،خوێن بەربونی برینەکە |
| Medication reaction or dosing issue | دەرمانی نوێ یان گۆڕانکاری لە ژەمەکانی دەرمان بەم دووایە. |
| Gaseous poisoning | مێژووی بەرکەوتن لەگەڵ مادە ژەهراوییەکە<br>ژمارەیەکی زۆر توشبوو<br>سەرئێشە |

## OTHER CAUSES

| نیشانەکانی | بارودۆخ |
| --- | --- |
| مێژووی توشبون بە گەشکە، Bitten tounge,<br>میز بە خۆدا کردن<br>باشتر بوون بە گوێرەی کات دەکرێت لە ماوەی چەن دەقەیەک باش ببێت و لەوانەشە چەن کاتژمێرێکی بوێت وە ئەگەر دووگیان بوو ئەگەری توشبون بە eclampsia لەبەرچاو بگرە | Seizures/convulsions |
| سەرئێشە،گەشکە،هێڵنجدان و ڕشانەوە، نایرکسانی لە بیلبیلەکان،لاوازی لە یەک لای جەستە یاخود کێشەی قسەکردن.<br>ئەگەر کەیسەکە زۆر سقیر بێت | Increased pressure on the brain (trauma, tumour, bleeding or brain swelling) |
| مێژووی بەکارهێنانی بەردەوامی کهول یان نەخۆشی جگەر،سکی گەورە دەبێت ، thin arm,زەردبوونی ڕەنگی پێست و چاوەکان واتە jaundice, و دابەزینی شەکرە | Liver disease |
| بەرزی پەستانی خوێن،ئاوساویی لە قاچەکان،کەمبونەوە یان نەمانی میزکردن ئەگەر کەیسەکە زۆر سقیر بێت | Kidney disease |
| گۆڕانکاری لە بینین ، لەدەسدانی یادەوەری،ڕشانەوە،سەرئێشە،مێژووی بەرکەوتنی زەبر،بوونی برین لە سەر یان ناتەواوی لە ئێسکەکانی سەر،سوربونەوەی دەموچاو بەتایبەت دەوروبەری چاوەکان یان پشتەوەی گوێ،شلەیەکی ڕوون یان خوێن لە لوت یان گوێی کەسەکە دێتە دەرەوە،نایەکسانیی لە بیلبیلەکان یاخود بێهێزی لە یەک لای جەستە،گەشکە | Head trauma |
| Agitation و ترس لە خواردنەوە، Drooling,بێهێزی،مێژووی پێوەدان یان گەستن لەلایەن ئاژەڵانەوە | Rabies |
| زۆر باوە لە منداڵانی بچوک، مێژووی دۆزینەوەی دەرمان لە دەوروبەری منداڵەکە | Ingestions of chemicals or TOXIN |

# DO: MANAGEMENT

سەرەتا هەڵسەنگاندنی ABCDE ئەنجام بدە و دەستوەردان بکە بۆ حاڵەتە مەترسیدارەکانی ژیان.
تێبینی: ئەگەر بۆری هەوا پاک بوو، و هیچ بەڵگەیەکی زەبر نەبوو، نەخۆشەکە بخەرە دۆخی چاکبوونەوە(recovery position)
بۆ ئەوەی شلە یان ڕشانەوە نەچێتە ناوەوەی سییەکان . [بڕوانە لێهاتووییەکان]

| حاڵەت | بەڕێوەبردن |
|---|---|
| Hypoxia | ئۆکسجینی پێ بدە،بگەڕێ بە دوای هۆکاری حاڵەتەکە. |
| Hyperglycemia | ئوگەر گومانی ئەوەت لە حاڵەتەکە کرد کە کیتۆ ئەسیدۆسیس بێ چارەسەری بکە لە ڕێگەی ئای ڤی فلودەوە(بڕوانە کارامەییەکان)، ئەو نەخۆشانەی حاڵەتی کیتۆ ئەسیدۆسسیان هەیە بە زوترین کات پێویستیان بە گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بەپەلە هەیە بۆ یەکەیەک کە توانای چاودێری کردنی وردی هەیە. |
| Hypoglycemia | گلوکۆز بە نەخۆشەکە بدە(بڕوانە کارامەییەکان). |
| Fever (hyperthermia) with altered mental status | دەست بە پێدانی دەرمانی دژە زیندەیی بکە. هەوکردنە توندەکان لەوانەیە پێویستیان بە چارەسەرکردن هەبێت لەلایەن دابینکەرێکی پێشکەوتووەوە. پشکنینی مەلاریا و چارەسەرکردن لە ناوچە تووشبووەکان لەخۆ بگرێت. هەروەها ژەهراوی بوون لەبەرچاو بگرە . چارەسەری تای بەرز بە پاراسیتامۆڵ بکە. [بڕوانە لێهاتووییەکان] بۆ بەرزبوونەوەی توندی پلەی گەرمی، نەخۆشەکە فێنک بکەرەوە و شلەی لە ڕێگەیIVیەوە پێ بدە. |
| Hypothermia | بیگوازەرەوە بە شوێنێکی تا ڕادەیەک گەرم، ئەگەر جل و بەرگی تەڕی لەبەردابوو لایبەرە،لە ڕێگەی blancket یکەوە هەوڵ بدە گەرمی بکەیتەوە وە ئەگەر پێویست بوو ئای ڤی فلودی پێ بدە. |
| Bleeding or other cause ofincreased pressure on the brain | ئەگەر گوومانی زەبر نەبوو جێگاکە بەرز بکەرەوە بۆ ٣٠ پلە. ئەگەر گومانی زەبر هەبوو دڵنیابە لە بێ جووڵەی بڕبڕەی پشت. [بڕوانە لێهاتووییەکان] |
| Opiod overdise | نالۆکسۆن بەکاربهێنە. [بڕوانە لێهاتووییەکان] کاریگەری نالۆکسۆن نزیکەی 1 کاتژمێر دەمێنێتەوە بەڵام زۆربەی ئۆپیۆیدەکان زیاتر دەمێننەوە و نەخۆشەکان لەوانەیە پێویستیان بە دووبارەکردنەوەی ژەمی نالۆکسۆن هەبێت. لەکاتی پلاندانان بۆ چاوەدێری بەردەوام ئەمە لەبەرچاو بگرە و پێویستە کەسەکە بەردەوام هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت و چاودێری ورد بکرێت. |
| Active seizure/convulsion | هەندێک جار پێویستە بە دەرمانیbenzodiazepines چارەسەری حاڵەتەکە بکەیت و پێویستە لە نزیکەوە چاودێری کەسەکە بکەیت بۆ ئەوەی بزانیت هەناسەدانی ئاساییە. گلوکۆزی خوێن بپشکنە یان گلوکۆز بدە بە نەخۆشەکە ئەگەر نەتتوانی پشکنین بکەیت. نەخۆشەکە بخەرە recovery position ئەگەر گومانی هیچ زەبرێک نەبوو. [بڕوانە لێهاتووییەکان] ئەگەر نەخۆشەکە بەردەوام بوو لە گەشکە یان لە نێوانیدا لە خەو هەڵنەستا، ڕاستەوخۆ کار بۆ گواستنەوەی بکە بۆ یەکەی پێشکەوتوو بۆ ئەوەی بتوانن بە وردی چاودێری هەناسەدان و بۆری هەوای نەخۆشەکە بکەن. |
| Pregnant with active seizure/convulsion | دەکرێت eclampsia بێت بۆیە پێویستە بەپەلە کار هۆ گواستنەوە/ڕادەستکردنەوەی بکرێت بۆ یەکەی پسپۆڕ وە پێویستە magnisium sulphate بدرێت (بڕوانە لێهاتوییەکان)، لە |

|  |  |
|---|---|
|  | نزیکەوە چاودێری نەخۆشەکە بکە بۆ نیشانەکانی ژەهراویبوون. [بڕوانە لێهاتووییەکان] ئەگەر هەریەکێک لەمانە روویدا، نابێت ژەمی زیادەی مەگنیسیۆم بدەیت. |
| **Alcohol withdrawal** | هەمیشە پشکنین بپ گلوکۆز بکە، ئەگەر پێویستی کرد چارەسەری withdrawal ەکە بکەیت بە benzodiazepine (بڕوانە لێهاتوویەکان)، لە نزیکەوە چاودێری بۆری هەوا بکە بە وردیی. |
| **Poisoning or envenomation** | هەوڵ بدە هۆکاری ژەهراویبونەکە بدۆزیەوە وە ئەو کەسانەی کە ژەهراویبوون بنێریتە یەکەیەکی پێشکەوتوو بۆ چارەسەری پێویست وەربگرن،ئەگەر ( pesticide) بوو هەوڵ بدە دڵنیابە لەوەی نەخۆشەکە پیس نەبووە، هەروەها لە نزیکەوە چاودێری بۆری هەناسە بکە چونکە دەردراوەکان دەبنە هۆی گیران. پێوەدانی مار پێویستە بەم شێوەیە چارەسەر بکرێت لە بەشی "wound managment"دا باسکراوە [بڕوانە لێهاتووییەکان] و بە زووترین کات ڕەوانەی نەخۆشخانەی بکە بۆ وەرگرتنی دژە ژەهر. |
| **Rabies** | هیچ چارەسەرێکی تەواوەتی نیە بۆ نەخۆشی هاریی symptomatic rabies. بە نزیکەی هەمیشەیی کوشندە دەبێت. بۆ بەڕێوەبردنی گومانی بەرکەوتنی زەبر بەهۆی پێوەدانی ئاژەڵەوە سەیری بەشی trauma بکە. |
| **Violet or very agitated patient** | نەخۆشەکە بپارێزە لە زیانگەیاندن بە خۆی یان کەسانی تر.<br>نەخۆشەکە دڵنیا بکەرەوە کە ڕێرەوێکی روونی دەرچوون هەیە (نەخۆشەکە با لە نێوان ستافەکەو دەرگاکە نەبێ).<br>چەک و شتە ناپارێزراوەکان لاببە.<br>پەیوەندی بکە بۆ وەرگرتنی یارمەتی لە هاوکارەکانت و ئەندامانی خێزانەکەت و ئاسایش ئەگەر پێویست بوو. بە تۆنێکی ئارام و نەرم و بێ هەڕەشە قسە بکە. روونی بکەرەوە کە لە هەر قۆناغێکی چاودێریدا چی ڕوودەدات. ڕووبەڕووی شتەکانی مەکەرەوە و حوکم مەدە.<br>هۆکارەکانی تر لەبەرچاو بگرن: پشکنینی گلوکۆز و نیشانە گرنگەکان لەوانە پلەی گەرمی و ئۆکسجین. کار بۆ ڕادەستکردنەوە/گواستنەوەی سەلامەت بۆ دابینکەری پێشکەوتوو بکە . |
| **Trauma** | هەڵسەنگاندنی GCS، بێ جووڵەکردنی بڕبڕەی پشت و هەڵسەنگاندن بۆ نیشانەکانی زیادبوونی فشار لەسەر مێشک. [بڕوانە کارامەییەکان] |

# SPECIAL CONSIDERATIONS

## بەڕێوەبردنی گەشکە (Active sizure)

- ✓ ABCDEپیشکنە.
- ✓ بۆری هەوا بپارێزە – هیچ شتێک مەخەرە ناو دەمی نەخۆش.
- ✓ ئەگەر نیگەرانی کەمی ئۆکسجین یان گەشکەی درێژخایەن بوویت، ئۆکسجین بدە بە نەخۆشەکە.
- ✓ نەخۆشەکە بخە سەر لایەک ئەگەر توانیت.
- ✓ نەخۆشەکە بپارێزە لە زیان یان برینداربوونی زیاتر .
- ✓ ڕێژەی گلوکۆز بپشکنە یان گلوکۆز بدە (ئەگەر نەتوانرا پشکنین بکەیت).
- ✓ دەرمانی بەنزۆدیازیپین بدە.
- ✓ ئەگەر دووگیان بوو نەخۆشەکە و توشی گەشکە بوو ، پێویستە magnesium sulphate وەربگرێت.
- ✓ ئەگەر هیچ وەڵامێک نەبوو، ژەمێکی تری بەنزۆدیازیپین بدە (ئەگەر پێویست بوو سێ جار دووبارەی بکەرەوە) و چاودێری بکە بۆ دابەزینی پەستانی خوێن و خاوبوونەوەی هەناسەدان. ئەگەر نەخۆشەکە لە نێوان گەشکەکاندا لە خەو هەڵنەستا و بەخەبەر نەهات، ئەمە بە حاڵەتێکی مەترسیدار بۆ سەر ژیانی بزانە. کار بۆ ڕێکخستنی ڕادەستکردن/گواستنەوەی خێرا بۆ دابینکەرێکی پێشکەوتوو بکە.
- ✓ ئەگەر گەشکەکە وەستا، نەخۆشەکە بخەرە سەر Recovery position و لە نزیکەوە چاودێری بکە.

### SPECIAL CONSIDERATIONS IN CHILDREN

ئەو منداڵانەی کە باری دەروونییان گۆڕاوە لەوانەیە نیشانە سووکەکانیان هەبێت وەک زیاتر لە منداڵانی ئاسایی خەواڵوون یان کەمتر جموجوڵی هەیە منداڵەکە. سەرەتا ABCDE بپشکنە بە وردی، پاشان بەدوای هۆکارەکانی گۆڕانی باری دەروونیدا بگەڕێ و بەڕێوەی ببە. لەبیرت بێت کە منداڵانی زۆر نەخۆش یان بریندار لەوانەیە نیشانە ژیانی ئاساییان هەبێت تاوەکو ئەوەی کە حاڵەتەکەیان بە خێرایی تێکدەچێت. کەمبوونەوەی شەکری خوێن زۆرجار لە منداڵانی تووشبوو بە نەخۆشیەکی توند ڕوودەدات و هۆکارێکی باوی گۆڕانی باری دەروونییە لە منداڵاندا. پشکنینی گلوکۆزی خوێن (یان گلوکۆزی پێ بدە ئەگەر نەتتوانی پشکنین بکەیت) لە هەر منداڵێکدا کە باری دەروونی گۆڕاوە.

کەمی ئۆکسجین دەکرێت لە ئەنجامی زۆر شتدا ڕووبدات، لەوانە هەوکردنی کۆئەندامی هەناسەدان و شۆک،کەمی ئۆکسجینی لەدایکبوون (Birth hypoxia) پێویستە ڕەچاوبکرێت لە منداڵانی تازە لەدایکبوودا. بەرزبوونەوەی گەرمی لەگەڵ گۆڕانی باری دەروونی پێشنیاری هەوکردن دەکات، بەڵام دەتوانرێت بە بەرکەوتنی گەرمی زۆر، جوڵەی زۆر، گەشکە،ناهاوسەنگی هۆرمۆنەکان و هەندێکیش ڕوویدات دەرمان و ژەهرەکان. هەروەها کەمبوونەوەی گەرمی لەگەڵ گۆڕانی باری دەروونی دەتوانێت پێشنیاری هەوکردن بکات، بەتایبەتی لە کۆرپەدا، بەڵام دەکرێت بوهۆی drug intoxication ، بەرکەوتن بە سەرما یان ناهاوسەنگی هۆرمۆنەکانەوە بێت. کۆرپە بچووکەکان زیاتر کاریگەری گۆڕانی پلەی گەرمییان لەسەرە. منداڵەکە گەرم بکەرەوە بە بەکارهێنانی بەتانی و کڵاو بۆ ڕێگریکردن لە لەدەستدانی گەرمی و بەکارهێنانی بەرکەوتنی پێست بە پێست (کە پێی دەوترێت "Kangaroo care") لەگەڵ ئەندامێکی خێزانەکە ٢٤ کاتژمێر لە ڕۆژێکدا لەکاتی نەخۆشیدا . گەشکە دەکرێت تەنها بەهۆی تا بێت وەک گەورە بەڵام دەتوانێت پێشنیاری هەوکردن، دابەزینی شەکری خوێن یان hyponatremia (کەم سۆدیۆم)یش بکات. ئەو نەخۆشانەی کە گومانی هەوکردنی جددی بەکتریایان هەیە، پێدانی دەرمانی دژە زیندەیی دوا مەخە. هەمیشە زەبر لەبەرچاو بگرە. هەوکردن لەناو مێشک یان دەوروبەری دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی. پشکنین بکە بۆ bulging , swollen fontanella (لە منداڵی خوار تەمەنی یەک ساڵ) و/یان پەڵە لە قاچ و خوارەوەی سک بگەڕێ، کە دەتوانێت ئاماژە بێت بۆ هەوکردن یان زیادبوونی فشار لەسەر مێشک. ئەو منداڵانەی کە گومانی هەوکردنی جددی بەکتریایان هەیە، پێدانی دەرمانی دژە زیندەیی دوا مەخە.



Flat fontanelle



Bulging fontanelle

**خراپی پەرفیوژن دەبێتە هۆی گۆڕینی باری دەروونی چونکە منداڵان زۆر بە خێرایی ئەگەری هەیە جەستەیان توشی وشک بونەوە بێت. پشکنینی نیشانەکانی وشکبوونەوەی پێست:** Abnormal skin pinch **،وشکبوونەوەی** Mucus membrane **، نائارامیی ،**Sunken or depressed fontanelle**(لە منداڵی خوار تەمەنی 1 ساڵدا)، پڕکردنەوەی موولوولەکانی خوێن هێواش بێت (زیاتر لە 3 چرکە)، پەلەکانیی سارده، تزیادبوونی لێدانی دڵ، و دابەزینی فشاری خوێن. بۆیە پێویستە شلەی IV پێ بدەیت و زوو زوو هەڵسەنگاندنی بۆ بکەیتەوەو چاودێری بکەیت. [بڕوانە لێهاتووییەکان]**

**لەوانەیە مەلاریا لە منداڵاندا توندتر بێت وەک لە گەورەکان. ئەو منداڵانەی کە مەلاریایەکی توندیان هەیە لەوانەیە بە کەمخوێنی توند، گەشکە، کۆما و دابەزینی شەکری خوێن خۆیان نیشان بدەن. خواردنی ماددە کیمیاییەکان یان دەرمانەکان لە منداڵاندا باو و ئاساییە هەوڵبدە ژەهرەکە بناسیتەوە (قسە لەگەڵ دایک و باوک بکە) و هەوڵبدە وێنەی پاکەتەکە وەربگریت. دەستبەجێ ڕاوێژ بە دابینکەری پێشکەوتوو بکە بۆ بەڕێوەبردن**

**بیر لە خواردنی بێ شایەتحاڵ بکەرەوە لە منداڵانی خوار تەمەنی ٦ ساڵ(بەتایبەت تەمەنی 1-3 ساڵ)**

**پرسیار بکە دەربارەی نیشانەکانی بەپێی ئەو مادەیەی کە خواردووی.**

**مێژوویەکی ورد لە خێزانەکە وەربگرە.**

**پشکنین بۆ بوتڵ یان شوشەی ماددەکە یان دەرمانەکە بکە کە منداڵەکە خواردویەتی.**

**دیاری بکە کە لە چ کاتێکدا ڕوویداوە.**

**دڵنیابوون لەوەی هیچ منداڵێکی تر بەشدار نەبووە.**

**پشکنین بۆ نیشانەکانی سووتاوی ناو دەم یان دەوروبەری دەم**

**پشکنینی** Stridor (Hight putched noise) **کە پێشنیاری خواردنی ئەو ماددە کیمیاییانە دەکات کە بۆری هەناسەیان سووتاندووە یان زیانیان پێگەیاندووە و دەبنە هۆی ئاوسانی بۆری هەوا.**

**ئەو منداڵانەی کە دەرمان یان ماددە کیمیاییەکانیان خواردووە پێویستە لە نزیکەوە چاودێری بکرێن و لەوانەیە پێویستیان بە ڕادەستکردن/گواستنەوە بۆ یەکەیەکی پێشکەوتوو هەبێت بۆ بەڕێوەبردنی زیاتر.**

# DISPOSITION CONSIDERATIONS

**(DISPOSITION) پەیوەستە بە هۆکاری گۆڕانی باری دەروونی. هۆکارەکانی گۆڕانی باری دەروونی کە ناتوانرێت بە خێرایی چارەسەر بکرێن یان کە ڕەنگە دوای وەرگرتنی دەرمانەکان بگەڕێنەوە پێویستیان بە چاودێری هەیە نەخۆشخانەدا.**

**هەر نەخۆشێک کە باری دەروونی گۆڕابێت دەبێت لە نزیکەوە چاودێری بکرێت بۆ کێشەکانی بۆری هەوا. بیر لە ڕادەستکردنەوە/گواستنەوە بکەرەوە بۆ دابینکەرێک کە توانای چاودێری کردنی وردو بەڕێوەبردنی حاڵەتەکانی پەیوەست بە بۆری هەواوە هەبێت**

**ئەگەر هۆکاری بنەڕەتی کەمبوونەوەی گلوکۆزی خوێن دەستنیشان نەکرێت و چارەسەر نەکرێت، ئەوا ئەو نەخۆشانەی کە دابەزینی شەکری خوێنیان هەیە و بە گلوکۆز باشتر بوون لەوانەیە دووبارە تووشی دابەزینی گلوکۆزی خوێن ببن و لەوانەیە پێویستیان بە دووبارەکردنەوەی چارەسەرکردن هەبێت. ئەم نەخۆشانە پێویستیان بە چاودێری ورد هەیە.**

**کاریگەرییەکانی نالۆکسۆن (فاکتەری پێچەوانەکردنەوەی ئۆپیۆید کە پێی دەوترێ( opiod reversal agent) تەنها نزیکەی 1 کاتژمێر دەخایەنێت. زۆرێک لە دەرمانە ئۆپیۆیدەکان کارکردنیان درێژترە و لەوانەیە پێویستیان بە ژەمی زیاتری نالۆکسۆن هەبێت بۆ پێچەوانەکردنەوەی کاریگەرییەکانی ئۆپیۆید. هەر نەخۆشێک کە بە نالۆکسۆن چارەسەر بکرێت دەبێت لە نزیکەوە چاودێری بکرێت. دڵنیابە لەوەی کە دابینکەری نوێ دەزانێت نەخۆشەکە نالۆکسۆنی پێدراوە و لەوانەیە پێویستی بە ژەمی زیادە هەبێت.**

MULTIPLE CHOICE QUESTIONS

Answer the questions below. Questions and answers will be discussed in the session.

1. You are evaluating ABCDE on a 4-year-old boy who has a fever and a cough. He is not responding to you calling his name, but if you pinch the sole of his foot, he moans. What is his level on the AVPU scale?

A. Alert

B. Verbal

C. Pain

D. Unresponsive

2. A 37-year-old male is brought in by his wife with fever and confusion. She says since the fever began 3 days ago he has become increasingly confused. There has been no trauma. On examination you notice that his neck is stiff. What is the most likely cause of his altered mental status?

A. Pneumonia

B. Infection around the brain

C. Stroke

D. Drug use

3. A 46-year-old man comes in to check his blood pressure. His vital signs are: blood pressure 160/90, heart rate 120, respiratory rate 18, and blood glucose is 5 mmol/L. While you are examining him he has a seizure/convulsion. What treatment should you give?

A. Benzodiazepine

B. Glucose

C. Antibiotics

D. Naloxone

4. A 36-week pregnant woman is having a seizure/convulsion. She has a recent history of high blood pressure as well. What treatment should you give?

A. Magnesium sulphate

B. Glucose

C. Nitroglycerin

D. Nothing, the seizure/convulsion will stop on its own

5. You are assessing a 6-month-old infant and find a depressed fontanelle. What does this physical examination finding suggest?

A. Infection in the brain

B. Dehydration

C. Pneumonia

D. Hypoglycaemia

**ئەم بەشە یارمەتی فێرخواز دەدات لەوەی کۆمەڵێک لێهاتووی فێربێت وە ڕاهێنانی لەسەر بکات بۆ ڕزگارکردنی ئەو کەسانەی ژیانیان لە مەترسیدایە**

---

**بیرهێنانەوە…**

**هەموو کاتێک کەلوپەلی خۆپاراستنی کەسیی (Personal protective equipment)ەکان بەکاربهێنە پێش ئەنجامدانی هەر کارێک بۆ نەخۆش.**

---

## .1AIRWAY SKILL STATIONS

## AIRWAY SKILL STATION: BASIC AIRWAY MANOEUVRES

### Opening the airway: adult head-tilt and chin-lift

**بەکاردێت بۆ ئەو نەخۆشانەی کە باری دەروونییان گۆڕاوە و ئەگەری هەیە نەتوانن بۆری هەوایان بپارێزن، بەڵام هیچ مێژوویەکی زەبریان نییە.**

- **کەسەکە بە ڕووی سەرەوە لەسەر ڕوویەکی تەخت و پتەو دابنێ.**
- **بە دەستێک سەری بکێشە بۆ دواوە و بە پەنجەکانت چەناگەی بەرز بکەرەوە.( بۆ ئەم مەبەستە دەستێک بخەرە پێشەوەی نەخۆشەکە و پاشان دوو پەنجەی دەستەکەی تر بخەرە سەر چەناگەی دەستەکانت بسووڕێنە، چەناگەت بەرەو سەرەوە دوور لە سنگ بجوڵێنە)**
- **ئەگەر دیار بوو وە توانیت بە چاو ببینی تەنە نامۆکان دەربهێنە.**
- **بەکارهێنانی (Suction) بۆ لابردنی هەر شلەیەک یان دەردراوێک لە بۆری هەوا ئەگەر پێویست بوو.**
- **بۆری هەوا بە کراوەیی بهێڵەوە – مەهێڵە سەری نەخۆشەکە دابەزێت چونکە ئەمە وادەکات بۆری هەوا دابخرێت.**

*Adult head-tilt and chin lift*

---

### Opening the airway: paediatric head-tilt and chin-lift

**ئەم تەکنیکە لەگەڵ ئەو نەخۆشانەدا بەکاربهێنە کە باری دەروونییان گۆڕاوە و ئەگەری هەیە نەتوانن بۆری هەوا بپارێزن، هەروەها هیچ مێژوویەکی بەرکەوتنی زەبریشیان نیە.**

- **لەبیرت بێت سەری منداڵان لە سەری گەورەکان گەورەترە بە بەراورد بە قەبارەی جەستەیان، بۆری هەوایان نەرمترە وە هەروەها ئاسانترە بۆ گیران کاتێک مل یان دەنوشتێتەوە. لە و منداڵانەی کە تەمەنیان تا ڕادەیەک گەورەیە دەتوانرێت بۆری هەوا بکرێتەوە بە جوڵاندنی سەر بۆ دواوە**
- **کۆرپە سەریان گەورەترە بە بەراورد بە قەبارەی جەستەیان. پێویستە سەریان لە( sniffing position) بێت.**
- **پشکنین ئەنجامبدە بۆ دەم و لابردنی تەنە نامۆ دیارەکان،وریابە لەوەی پاڵ بە تەنی نامۆ نەنێیت بۆ**

قوڵترو بچێتە ناو بۆری هەناسە.

- بەکارهێنانی Suction بۆ لابردنی هەر شلەیەک یان دەردراوێک لە بۆری هەوا.
- سەری منداڵەکە وەک خوارەوە لە شوێنی خۆیدا بگرە بۆ ئەوەی بۆری هەوا بە کراوەیی بمێنێتەوە



Neutral position in infants    Head-tilt and chin-lift in children (no trauma)

## Opening the airway: adult and paediatric jaw thrust

ئەم تەکنیکە کاتێک بەکاردێت کاتێک نەخۆشەکە باری دەروونی گۆڕاوە و لەوانەیە نەتوانێت بۆری هەوا بپارێزێت و مێژووی زەبری هەبێت (ئەگەری شکانی بڕبڕەی پشت و مل هەیە:

- داوا لە یاریدەدەرێک بکە کە بڕبڕەی پشتی بپارێزێت لە جوڵەکردن لەکاتێکدا کە تۆ
- (jaw thrust) ئەنجام دەدەیت
- پشکنینی دەم و دەرهێنانی تەنی نامۆ ئەگەر دیار بوو.
- بەکارهێنانی (suction)بۆ لابردنی هەر شلەیەک یان دەردراوێک لە بۆری هەوا ئەگەر پێویست بوو.
- چەناگە لە شوێنی خۆیدا ڕابگرە بۆ ئەوەی بۆری هەوا بە کراوەیی بمێنێتەوە – مەهێڵە چەناگە دابەزێت بۆ خوارەوە چونکە ئەگەری هەیە ئەمە بۆری هەوا دادبخات.



Jaw thrust in children    Jaw thrust in adults

**ئەگەر لەناکاو لەکاتی نان خواردندا نارەحەتی و کێشەی هەناسەدان ڕوویدا، وە کەسەکە قوڕگی گرتبێت، یان کۆکەی هەبوو،وە ساینۆسیسی هەبوو واتە پێستی شین بوبێتەوە، (stridor ,noisy breathing)هەبوو، گومان بکە تەنێکی نامۆ بوبێتە هۆی گیرانی بۆری هەواو ڕێگری لە هەناسە کردبێت.**

- **هاندانی کەسەکە بۆ قسەکردن یان کۆکە ئەگەر دەکرێت ، چاودێری بکە ئەگەر تەنە نامۆکە دەرهێنرا و لابرا. ئەگەر کەسەکە بە شێوەیەکی بیستراو کۆکە و/یان توانای دەرهێنانی دەنگی هەبوو، ئەوا ئەم خاڵانەی لە خوارەوە باسکراون ئەنجام مەدە.**

**کەسێک کە توانای قسەکردنی نەبێت یان کۆکە بکات، بۆری هەناسە بە تەواوی گیراوە و پێویستی بە یارمەتی خێرا هەیە:**

- **بە کەسەکە بڵێ کە بڕیارە یارمەتی پێشکەش بکەیت.**
- **پێنج پەستانی سک (abdominal thrust)ئەنجام بدە (بۆ گۆڕانکارییەکان بۆ ژنانی دووگیان سەیری خوارەوە بکە).**
- **لە پشت کەسەکەوە بوەستە و کەسەکە پاڵ بنێ بۆ پێشەوە.**
- **بە دەستێک مشتێک دروست بکە و بیخە ناوەڕاستی سک لە نێوان ناوک و بەشی خوارەوەی ئێسکی مەمک.**
- **دەستەکەی ترت بخەرە سەر مشتەکەت.**

**تێبینی: ئەگەر نەخۆشەکە دووگیان بوو، مشتی دەستت لە ناوەڕاستی سنگدا دابنێ و بە توندی بەرەو ناوەوە ڕابکێشە**

- **پێنج جار بە بەکارهێنانیThrust ی سەخت و خێرا کە ئەمەش هەوا ناچار دەکات لە سییەکانی نەخۆشەکە دەربچێت و یارمەتی "فرێدانی" بەربەستەکە دەدات کە بووەتە هۆی گیرانی بۆری هەوا.**
- **ئەگەر بەربەستەکە بەردەوام بوو، با کەسەکە لە کەمەرەوە بچەمێتەوە وFive back blowئەنجام بدە (بە لەپی دەستت، پشتی لە نێوان شانەکاندا بە ئاراستەی سەری لێبدە ودووبارە هەڵسەنگاندن بکەرەوە).**
- **دووبارەکردنەوەی (abdominal thrust-back blow) تا نەخۆشەکە قسە دەکات، دەکۆکێت یان بێهۆش دەبێت.**
- **ئەگەر کەسەکە بێهۆش بوو، دەموچاوی بەرز بکەرەوە لەسەر ڕوویەکی پتەو ئەنجامدانی Chest thrustلەوانەیە بەربەستەکە لابدات و کەسەکە ڕزگار بکات،ئەگەر زنجیرەیەک لە Chest thrustسەرکەوتوو نەبوو، بەردەوام بە لە Rescue breathes and chest compression بە پشتبەستن بە پرۆتۆکۆڵە پەیوەندیدارەکانی(CPR).**



Abdominal thrusts for choking adult



Chest thrusts for choking in late pregnancy

## Managing choking in an infant or small child

- کۆرپەکە لەسەر قۆڵ یان ڕانت بە شێوەیەک دابنێ کە ڕووی  لە خوارەوە بێت و سەری لە سکی خوارتر بێت.
- (five back blow)بە لەپی دەستت، بە توندی لە پشتەوە لە نێوان شانەکاندا بە ئاراستەی  سەر ئەنجام بدە.
- ئەگەر بەربەستەکە لانەچوو وە گیرانەکە بەردەوام بوو، کۆرپەکە هەڵگەڕێنەرەوە.
- (chest thrust)بە دوو پەنجە بدە ئەنجام بدە، لە خوار هێڵی گۆی مەمک لە هێڵی ناوەڕاستی سنگ.
- ئەگەر گیران بەردەوام بوو، دەمی کۆرپە بپشکنە بۆ هەر بەربەستێکی دیار کە دەتوانرێت لاببرێت (ئاگاداری گازگرتن بە)
- ئەگەر پێویست بوو تەواوی پرۆسەکە دووبارە بکەرەوە تاوەکو تەنە نامۆکە دەردەهێنرێت.





Back blows for choking in infants





Chest thrusts for choking in infants

## AIRWAY SKILL STATION: AIRWAY SUCTIONING

- مەبەست لە(suction) بریتییە لە لابردنی هەر شلەیەک یان دەردراوێک لە بۆری هەوا لە بەشی سەرەوە. ڕەنگە(suction) پێویست بێت بۆ پاراستنی بۆری هەوا ئەگەر کەسەکە نەتوانێت دەردراوەکان پاک بکاتەوە بەبێ یارمەتی.
- بزانە کە ئایا(Suction canister) یان ئامێری دەستییەکە کاردەکات یان نا.
- کاثێتەرێکی ڕەق یان نەرم بە کۆتایی بۆری(Suction tubing) ببەستە
- ڕوونی بکەرەوە کە چی دەکەیت بۆ نەخۆشەکە.
- هەوڵ بدە کاثێتەرەکە ببەیتە بەشی پشتەوەی دەمی نەخۆش ،کەڤەری ئەو بەشە کراوەییە بکە کە لە کاثێتەرەکەدایە لە لاتەنیشت(نەک کونی سەرەوەی کاثێتەرەکە)بۆ دروستکردنی سەکشن.
- سەکشن تەنیا کاتێک ڕوودەدات کە جوڵە بە کاثێتەرەکە بکەیت بۆ دواوەو پێشەوە چونکە وەستاندنی لە یەک شوێن دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە شانەکان،بەردەوام بە لە سەکشن کردن تاوەکو هەموو شلەکان لە دەمی نەخۆشەکە دێتە دەرەوە.
- بۆ ئەوەی بەدووربی لە زیان گەیاندن بە شانەکان ڕاستەوخۆ کاثێتەرەکە لەسەر شانەکە و لەیەک شوێن دایمەنێ وە هەروەها بەتەنیا لە ناو دەمدا سەکشن بکە هەوڵ مەدە بەرەوە سەرەوە بۆ لوت بیکەیت.

له یەک کاتدا زیاتر لە ١٠ چرکە سەکشنەکە ئەنجام مەدە مەگەر بۆری هەناسە بە تەواوی بە شلە گیرابێت.

## AIRWAY SKILL STATION: BASIC AIRWAY DEVICE INSERTION

Oropharyngeal airway (OPA) insertion

- بۆری هەوا لە رێگەی دەم و قورگەوە (OPA) تەنها کاتێک پێویستە بخرێتە ناوەوە کە کەسەکە بێهۆش بێت. کەسێکی کە هۆشیارە بەرگەی OPA ناگرێت و پاڵی پێوە دەنێت لە حاڵەتێک ئەگەر کەسەکە بەرگری کرد، یان هێلنجانی هەبوو یان ڕشایەوە، دەستبەجێ ئامێرەکە دەربهێنە.
- هەمیشە بڕبڕەی پشتی و ملی بپارێزە کاتێک مێژووی زەبرهەیە.
- قەبارەی گونجاوی OPA بپێوە بە پێوانەکردن لە نوکی گوێچکە تا گۆشەی دەم.
- دەمی کەسەکە بکەرەوە بە وریاییەوە ، پەنجەکانت مەخەرە ناو دەمی کەسەکە(بۆ ئەوەی بە هەڵە گازی لێ نەگرێت).

(curved portio) بە لایەکدا بێت و نووکەکەی ئاراستەی ڕوومەت بێت

- بە نەرمی پاڵ بە OPA بنێ بۆ ناو دەم و کاتێک ناتوانیت زیاتر پاڵ بنێیت، OPAبە ٩٠ پلە بسووڕێنە، بەجۆرێک ئێستا نووکەکەی ئاراستەی بەرەو قورگ بێت و بەدوای زماندا بڕوات
- ئەگەر پێویست بوو پاشماوەکەی پاڵ بنێ بۆ ژوورەوە بەجۆرێک کە فلنجەکە (کۆتاییە پان و تەختەکەی) لەسەر لێوی کەسەکە جێگیر بێت. دڵنیابە لەوەی کە نوکی OPA زمان پاڵ نانێتە خوارەوە نەک بەشی پشتەوەی قورگەکە بگرێت.
- دووبارە پشکنین بکەرەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بیت کە OPA زمانی پاڵنەناوە بۆ خوارەوە و ڕێگری لە هەماسەدان نەکردووە.
- ئەگەر بەردەست بوو ئۆکسجین بدە.



Oropharyngeal airway (OPA) insertion

## Nasopharyngeal airway (NPA) insertion

- بۆری هەوای لە ڕێگەی لووت و قورگ (NPA) باشتر گونجاوە بۆ ئەو کەسانەی کە نیمچە هۆشیارن بەڵام لەو کەسانەی زەبریان بەرکەوتوە، NPAنابێ بەکاربهێنرێت.
- هەڵسەنگاندن بۆ ڕێڕەوی لووت بکە بۆ هەر گیرانێکی بۆری هەوا.
- قەبارەی گونجاوی NPA دیاری بکە بۆ دانانی لە بنی کونەکانی لووتەوە تا لووتکەی گوێ پێوانە بکە. تیرەی NPA خۆی پێویستە بچووکتر بێت و گونجاو بێت بۆ ڕێڕەوی لوتی کەسەکە.
- NPAبە باشی چەور بکە بکە و بیخە ناو کونە لووتەوە، بە درێژایی ناوەوەی لووت ئاراستەی بکە لە دواوە بەرەو قورگ تاوەکو بەشە پان و تەختەکەی بە کونە لووتەکەوە دەوەستێت..
- ئەگەر هەبوو ئۆکسجین بدە.



Nasopharyngeal airway (NPA) insertion

## 2-BREATHING SKILL STATION

## BREATHING SKILL STATION: BREATHING EXAM

- ڕێژەی هەناسەدان هەڵبسەنگێنە و بیژمێرە (ئاسایی لە نێوان 10-20 هەناسەدان لە خولەکێکدا لە کەسێکی پێگەیشتوودا. بۆ منداڵان سەیری مۆدیولی ABCDE بکە).
- لە کاتی پشکنیندا بەدوای زیادبوونی کاری هەناسەداندا بگەڕێ.
(nasal flaring, retractions chest in-drawing)
- لە کاتی پشکنیندا هەست بە بەرزبوونەوەی سنگ و (chest wall tenderness) بکە
- پێرکەشن ئەنجام بدە:
- دەستێک لەسەر سنگی نەخۆشەکە دابنێ پەنجەکانت با بڵاوبێت لەسەر سنگی (پەنجەی ناوەڕاست دەبێت لە نێوان پەراسووەکاندا بێت).
- بە دەستەکەی تر، پەنجە بخەرە سەر پەنجەی ناوەڕاستی دەستی یەکەم و گوێ بگرە بۆ گۆڕانکاری لە تۆن (hollow or dull).
- گوێ لە سنگی نەخۆش بگرە:
- هەمیشە سنگی نەخۆشەکە با دیاربێت هەرگیز لە سەروو جل و بەرگەوە گوێ مەگرە.
- دڵنیابە کە بیستۆکەکەت (Stethoscope)زۆر سارد نییە.
- ستێتۆسکۆپەکەت لەسەر دیواری سنگ دابنێ، داوا لە نەخۆشەکە بکە دەمی بکاتەوە و هەناسەیەکی قووڵی تەواو هەڵمژێتە ژوورەوە و بیداتەوە، گوێ لە دەنگی هەناسەدان بگرە و لای چەپ بەلای ڕاست بەراوردی

بکە. لە بەشی سەرەوە و ناوەراست و بەشی خوارەوە گوێ بگرە و گوێ لە پێشەوەی سنگ و پشتەوە بگرە.

- هەناسەدانی ئاسایی وەک جووڵەی هەوا دەچێتە ژوورەوە و دێتە دەرەوە، لە کاتێکدا هەناسەدانی نائاسایی وەک ئەوە وایە هەوا بە ئاودا تێپەڕببێت (Crackle sound)، یان هیچ هەوایەک بە هیچ شێوەیەک نەجوڵێت.
- ڕێز لە نەخۆشەکە بگرە وە دوور بکەوەرەوە لە دانانی ستێتۆسکۆپ ڕاستەوخۆ لەسەر مەمکەکانی.

## BREATHING SKILL STATION: GIVING SUPPLEMENTAL OXYGEN

- پێویستە ئۆکسجینی پێویست بدرێت کاتێک نەخۆشەکە نیشانەکانی کەمی ئۆکسجینی هەیە وەک (هەناسەدانی خێرا، دڵەراوکێ، ئارەقەکردنەوەی زۆر، سیانێوس یان ئازاری سنگ لەو شوێنانەی کە بەردەستە، پێویستە ئۆکسیمێتەرێکی پەستانی خوێن بەکاربهێنرێت بۆ پێوانەکردنی (Oxygen saturation).
- ئەگەر کەمی ئۆکسجین بە شێوەیەکی توند دەرنەکەوت، دەتوانرێت ئاستی نزمتری ئۆکسجین (24-40% ئۆکسجین) لە ڕێگەی کانولەی لووت(nasal prongs) وەو بۆ منداڵان و گەورەکان دابین بکرێت، بەڵام لە نزیکەوە چاودێری بکەن لە ئەگەری پێویستی بە دەمامک هەبوو(لەبیرت بێت، هەوای ئاسایی نزیکەی 21% ئۆکسجینە) --کانولەی لووت دەبێت نزیکەی نیوەی قەبارەی کونی لووتی نەخۆش بێت.
- کانولەکە لە هەر کونێکی لووتدا دابنێ، دڵنیابە لەوەی کە زۆر درێژ نابێتەوە بۆ دواوە یان فشار نەخاتە سەر شانەکانی پشتەوە.
- تیوبەکە بە ڕوومەتەکانەوە ببەستە یان بەسەر گوێچکەکاندا بیبەستە بەجۆرێک کە prongs و بۆرییەکە هەردووکیان لە لای پێشەوەی جەستەی نەخۆشەکە بن ئۆکسجین بە ڕێژەیەکی کەم بگەیەنرێت: زۆرترین 5 L/min.
- ئەگەر کەمی ئۆکسجین توندتر دەرکەوت (یان ئەگەر نیشانەکانی کەمی ئۆکسجین بەردەوام بن لەگەڵ ئەوەی زۆرترین ڕۆیشتنی ئۆکسجینمان لە ڕێگەی کانولەی لووتەوە پێداوە)، ڕەنگە دەمامکێکی سادەی دەموچاو گونجاو بێت بەکاربهێنرێت. (Simple mask) ماسکی دەموچاوی سادە بەزۆری بە ڕێژەی لێشاوی ئۆکسجین 6-10 L/min واتە شەش بۆ دە لیتر لە ماوەی خولەکێک دابین دەکات و دەتوانێت نزیکەی 40-60% ئۆکسجین بگەیەنێت.
- ماسکی دەموچاو دەخرێتە سەر دەموچاو، دڵنیا دەبێتەوە لە داپۆشینی لووت و تا دەتوانرێت کەمترین دزەکردن پێویستە ماسکەکە لە خوار لێوی خوارەوە بە تەواوی بگرێتەوە بەڵام لە چەناگە تێپەڕ نەکات. پێویستە تەوقە لاستیکەکە لەسەر سەر دابنرێت بۆ ئەوەی دەمامکەکە بەتەواوی جێگیر بێت.
- ئەو نەخۆشانەی کە زۆر کەم ئۆکسجین دەردەکەون یان هێشتا نیشانەکانی کەمی ئۆکسجینیان هەیە بە ماسکی دەموچاوی سادە، دەتوانرێت ئۆکسجین لە ڕێگەی ماسکی (non re breather face mask) ئەمەش نزیکەی 100% ئۆکسجین دابین دەکات ئەگەر کیسی خەزنەکە (reservoir bag)پڕ بێت.
- بۆ ئامادەکردنی ئەم شێوازە ماسکە، پەنجەیەک بخەرە سەر وەلڤەلەکە لە سەرەوەی کیسی خەزنەکە لە ناو ماسکەکەدا بۆ ئەوەی کیسەکە هەڵئاوسێت، پاشان ماسکەکە بە هەمان شێوەی ماسکی سادەی دەموچاو بەکاربهێنە، دڵنیابە لەوەی کەمترین دزەکردن هەیە.
- دڵنیابە لەوەی کە ئۆکسجینەکە بە ئۆکسجینەوە بەستراوەتەوە و ڕێژەی لێشاوی لە نێوان 10-15 L/min دایە بە پێی پەستانی سیستەمی ئۆکسجینەکەت وە خێرا و قووڵی هەناسەدانی نەخۆشەکە. ئەگەر نەخۆشەکە هێشتا کەم ئۆکسجین بوو یان کیسی ماسکەکە پڕ نەبوو، ڕێژەی لێشاوی ئۆکسجین زیاد بکە.

- هەرگیز ماسکی(non re breathe) دامەنێ پێش ئەوەی بەستریتەوە بە ئۆکسجین، ماسکی ( non re breather mask) ڕێگە نادات هەوای دەرەوە بچێتە ژوورەوە و دەتوانێت سەختی هەناسەدان و کەمی ئۆکسجین خراپتر بکات ئەگەر ئۆکسجین بەناو بۆرییەکەدا نەڕوات




## BREATHING SKILL STATION: BAG-VALVE-MASK VENTILATION

هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردنی بۆری هەوا و دابینکردنی (BVM) بۆ هەر نەخۆشێک کە هەناسەدانی نییە یان هەناسەدانی بە شێوەیەکی گونجاو نیە (زۆر خاوە بە گوێرەی تەمەنی یان زۆر قووڵە)، هەر نەخۆشێکی بێهۆش کە هەناسەدانی نائاساییە (هێواش، قووڵ، هەناسەدان یان ژاوەژاوی هەیە)، یان هەر نەخۆشێک کە پەڵسی نییە (بۆ ئەو نەخۆشانەی کە پەستانی خوێنیان نییە، پرۆتۆکۆڵە پەیوەندیدارەکانی CPR پەیرەو بکە).

هۆشیاری! دوور بکەوەرەوە لە بەکارهێنانی (bag valve mask) بە پەستانێکی زۆر (بە خێرایی یان بە فشارێکی زۆر) چونکە ئەمە زیان بە سییەکان دەگەیەنێت. منداڵان سییەکانی بچووکترن وە ناسکترە. لەکاتی هەناسەداندا، وریابە تەنها فشارێکی تەواو بدەیت بۆ ئەوەی سنگ بەرزبێتەوە و دڵنیابە کە کاتێکی پێویستت پێدەدەیت لە نێوانیدا بۆ هەناسەدان (بۆ ئەوەی هەوا دەربچێت). قەبارەی زۆری هەوا یان پەستانی بەرز لەوانەیە ببێتە هۆی تێکچوونی سییەکان یان زیان لێکەوتنێک کە ئەگەری دووبارە باشبونەوەی نەبێت

### Bag-mask-ventilation steps:

- ئەگەر ئۆکسجین بەردەست بوو تیوبی باگ ڤاڵڤ ماسکەکە ڕێک بخەو لێشاوەکە لەسەر بەرزترین ڕێژە دابنێ ، هیچ کاتێک بەهۆی نەبونی ئۆکسجینەوە(bag-valve-mask ventilation) دوامەخە چونکە دەکرێت دوای دانانەکەی ئۆکسجینەکەی پێوە ببەسترێت.
- ماسکەکە بخەرە سەر دەم و لوتی نەخۆشەکە (ئەگەر چەن کەسێکت لە دەوروبەر بوو ئەوا داوایان لێ بکە کەسێک کیسەکە بگوشێت و کەسێکی تر دەمامکەکە لەسەر دەموچاوی نەخۆشەکە بگرێت و بۆری هەوا بە کراوەیی بهێڵێتەوە).
- بە تەواوەتی لەسەر دەمو لوتی نەخۆش داینێ بە شێوەیەک دڵنیابەرەوە لەوەی کە ئەوەی هەوا دزە نەکاتە دەرەوە. دەست یان دەستەکانت بە شێوەی– "EC" ڕابگرە بە شێوەیەک پەنجەی گەورە و پەنجەی یەکەم پێویستە "C" لە دەوری سەرەوەی دەمامکەکە دروست بکات و بە شێوەیەکی یەکسان پاڵی بنێت بۆ خوارەوە

سێ پەنجەی کۆتاییت دەبێت بگاتە تەنها ژێر بەشی ئێسکی چەناگە (کە لە "E" بچێت) و چەناگە بەرەو سەرەوە ڕابکێشیت بۆ کردنەوەی بۆری هەوا.

- بیر لە ڕاکێشانی دەموچاو بکەرەوە بۆ سەرەوە بۆ دەمامکەکە (بەم شێوەیە بۆری هەوا دەکرێتەوە) و پاڵنانی ماسکەکە بۆ خوارەوە بۆ سەر دەموچاو.
- ئەگەر زۆر بە توندی پاڵ بە خوارەوە بنێیت بەبێ ئەوەی دەموچاوی بۆ سەرەوە بۆ دەمامکەکە ڕابکێشیت، ئەوا بۆری هەناسە دەگیرێت و نەخۆشەکە قورس دەبێت هەناسەبدات. ئەگەر کێشەی هەواگۆڕکێت هەبوو، دەستەکانت بگۆڕە(مەبەست لێی گرتنی ماسکەکەیە)و دەمامکەکە بگۆڕە و دووبارە هەوڵبدەرەوە.
- کاتێک نەخۆشەکە خۆی هەناسە دەدات، هەناسەکان بگەیەنن (لە کاتی (inhalation)هەوڵ مەدە هەناسەیەک بدەیت لە کاتی(exhalation)دا.
- ئەگەر دوای دووبارە دانانەوەی شوێنی ماسکەکە هێشتا نەتوانیت یارمەتی هەناسەدانی کەسەکە بدەیت، ئەگەری گیرانی تەنی نامۆ یان دزەکردنی هەوا لەبەرچاو بگرە (Oropharengeal or . nasopharengeal tube)دابنێ ئەگەر پێشتر دانەنرابوو.
- کیسەکە بە دەستێک بگرە و کیسەکە ئەوەندە بگوشە کە سنگی نەخۆش بەرزبێتەوە (بۆ نزیکەی یەک لەسەر سێی قەبارەکەی بۆ کەسێکی گەورەساڵ وە دڵنیابە کە کیسەی قەبارە گونجاو بەکاردەهێنیت کیسەیەکی گەورەساڵان دەبێت قەبارەی نزیکەی ٢ لیتر بێت)
- بۆ ماوەی 1-2 چرکە فشار بخەرە سەری بۆ ئەوەی سنگی نەخۆشەکە بەرزبێتەوە (هەناسەدان ئەگەر خێراتر بێ ئەگەری هەیە ببێتە هۆی تێکچوونی سییەکان)
- لە هەر ٦ چرکەیەکدا یەک هەناسە بدە (١٠ هەناسە لە خولەکێکدا) لە کەسێکی پێگەیشتوودا؛ لە هەر ٤ چرکەیەکدا یەک هەناسە (١٥ هەناسە لە خولەکێکدا) لە منداڵانی گەورەتردا؛ یان یەک هەناسە لە هەر ٣ چرکەیەکدا (٢٠ هەناسە لە خولەکێکدا) لە کۆرپەدا. پێدانی ڕێژەیەکی زۆر گەورە لە ئەو کاتەدا دەکرێت ببێتە هۆی هۆی(pneumothorax).
- دوای هەر هەناسەیەک ڕێگە بدە سنگ بگەڕێتەوە باری ئاسایی پێش ئەوەی هەناسەیەکی تر بدەیت.
- لەگەڵ هەر هەناسەیەکدا سەیری بەرزبوونەوە و دابەزینی سنگ بکە بە شێوەیەکی یەکسان.


BVM: One provider


BVM: Two providers


BVM: Child

# BREATHING SKILL STATION: EMERGENCY NEEDLE DECOMPRESSION

(Needle decompression) ڕێکارێکی فریاگوزاری ڕزگارکەری ژیانی نەخۆشە کاتێک بەکاردەهێنرێت کە ئەم نەخۆشانە پێویستیان بە(tension pneumothorax)(emergency needle decompression) وە ئەنجامدانی ئەم کردارە پەستانی سەر سییەکان کەم دەکاتەوە دەستبەجێ و کات دەدات بۆ ڕادەستکردنەوە/گواستنەوەی بۆ یەیەکی پسپۆڕ بە مەبەستی دانانی بۆری سنگ. (Chest tube)وریابە ئەنجامدانی ئەم مردارە تەنیا لە حاڵەتێکدایە کە بە تەواوی دڵنیابیتەوە لەوەی tension pneumothorax دەبێت ئەنجام بدرێت.

- سنگی نەخۆشەکە دەربخە و هەناسەدانی هەڵسەنگێنە.
- ئەگەر شۆک و ئەمانەی خوارەوە هەبن، ئەوا (tension pneumothorax) دەناسرێتەوە:
- سەختی هەناسەدان
- نەبوونی دەنگی سییەکان لە لایەنی تووشبوو
- دابەزینی فشاری خوێن
- هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانی مل
- لە ماوەی پشکنین ئەو دەنگەی گوێت لێی دەبێت (Hyperreesonance)ە
- دورکەوتنەوەی trachea بۆ دور لە لای توشبوو
- بردنە ناوەوەی کانولەیەکی گەورە (G16-14)لە نێوان دووەم و سێیەم پەراسوو واتە ئینتەرکۆستاڵ سپەیسەوە (upper edge of the third rib through the second rib(intercostal) space in the line with the midpoint of the clavicl on the affected side
- لە تێنشن نیومۆثۆراکس دا دەتوانیت گوێت لە دەرچونی هەواکە بێت دوای ئەنجامدانی Needle decompression
- ئۆکسجین بدە بە چڕیی بەرز
- پێدانی شلەی ئای ڤی.
- دەستبەجێ ڕەوانەکردن و گواستنەوەی بۆ یەکەیەکی چاودێری.
- چێست تیوب ڕاستەوخۆ بە زووترین کات پێویستە دابنرێی دوای ئەنجامدانی Needle Decompression هەتا ئەگەر هاتوو هەواکە نەهاتە دەرەوە یاخود گومانی ئەوە هەبوو Haemothorax بێت حاڵەتەکەی.



*Needle decompression*

## BREATHING SKILL STATION: MANAGEMENT OF OPEN PNEUMOTHORAX (SUCKING CHEST WOUND

**بریتییە لە برینێکی کراوەی دیواری سنگ کە هەوا دەمژێتە ناوەوە کاتێک نەخۆشەکە**Sucking chest wound **هەناسە وەردەگرێت**(inhalation)، **بە شێوەیەکی ئاسایی کاتێک دیواری سنگ فراوان دەبێت، هەوا لە ڕێگەی بۆری هەناسەوە دەچێتە ناو سییەکان،بەڵام ئەگەر کونێکی دیکە لە دیواری سنگدا هەبێت (بەهۆی زەبرەوە) هەواش لە ڕێگەی ئەو کونەوە دەچێتە ناوەوە بەڵام لەبری ئەوەی بچێتە ناو سییەکان، دەچێتە ناو بۆشایی نێوان دیواری سنگ و سییەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی پەستان. پەردەی سێ لایەنی دادەنرێت بۆ ئەوەی هەوای زیاتر لە کاتی هەناسەداندا نەچێتە ژوورەوە، بەڵام بۆ ئەوەی هەوای سنگ لە کاتی هەناسەدان دەربچێت بۆ ئەوەی دوور بکەویتەوە لە دروستکردنی تێنشن نیومۆثۆراکس. بۆ بەڕێوەبردنی ئەم حاڵەتەش**

- **ئۆکسجین بە لێشاوی بەرز بدە بە نەخۆشەکە**
- **برینەکە داپۆشە بە گۆزی پترۆلیۆم یان**non adhesive dressing
- **سێ بەش لێی بە پلاستەر ببەستە، لایەکی بە کراوەیی بە بەجێبهێڵە**
- **پێویستە ئەم نەخۆشانە بە زووترین کات بگوازرێنەوە بۆ سەنتەرێک کە توانای دانانی** chest tube **هەبێت**
- **هەوڵ مەدە** chest tube **لە ڕێگەی برینەکە بخەیتە ناوەوە**

---

## هۆشیاری!

**مەترسی ئەوە هەیە کە ئەو پارچە گۆزەی بەکارت هێناوە بە دیواری سنگەوە بنوسێت بەهۆی خوێنەوە. کاتێک ئەمە ڕوودەدات، هەوا ناتوانێت لە بۆشایی سنگ دەربچێت و پەستانەکان زیاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی** tension pneumothorax **ئەگەر دۆخی هەناسەدانی نەخۆش خراپتر بوو یان بەڵگەی خراپتربوونی پەرفیوژن هەبوو، گۆزەکە بە تەواوی لاببە. ئەگەر نەتتوانیی بە بەردەوامی چاودێری نەخۆشەکە بکەیت، نابێت پەردەی سێ لایەنی دابنرێت.**(Three side dressing)

## BREATHING SKILL STATION: HOW TO MAKE A SPACER FROM A PLASTIC BOTTLE

**مەبەست لە** (SPACER)**بریتییە لە ڕاگرتنی (سالبوتامۆڵ) کە لە ئامێری هەڵمژینی ژەمی پێوراوەوە دەردەچێت بۆ ئەوەی کەسەکە کاتێکی هەبێت بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کاریگەر دەرمانەکە هەڵمژێت. (بەبێ ئەزموون و ڕاهێنانی دروست، بەکارهێنانی ئامێری هەڵمژینی ژەمی پێوراو بە شێوەیەکی کاریگەر ئەستەمە و زۆرجار دەرمان لە دەم یان قوڕگدا لەدەست دەچێت و وقدەکات نەخۆشەکە سودی لێ وەرنەگرێت). بەڵام پێویستە پێشوەختە** (SPACER)**دروست بکرێن. گەیاندنی سالبوتامۆڵ دوا مەخە بۆ دروستکردنی** SPACER



*Spacer made from a plastic bottle*

## 3- CIRCULATION SKILL STATIONS

## CIRCULATION SKILL STATION: CIRCULATION EXAM

### CIRCULATION SKILL STATION: CIRCULATION EXAM

- **پشکنین ئەننجام بدەو بگەڕێ بە دوای ( دڵەڕاوکێ، سەرلێشێواوی یان گۆڕانی باری دەروونی.)**
- **پشکنین بۆ هەستکردن بە پەڵس بکە، لەگەڵیشیدا هەڵسەنگاندنی ڕێژە و کوالیتی بکە (مەودای ئاسایی** 100-60 **لێدان لە خولەکێکدا لە گەورەکاندا)**
- **هەڵسەنگاندنی پڕکردنەوەی موولوولەکان مەودای ئاسایی کەمترە لە ٣ چرکە.**
- Vital signs**پێوە: ڕێژەی هەناسەدان و پەڵس (بەها ئاساییەکانی گەورەساڵان:** RR 10-20 **هەناسە لە خولەکێکدا و** BP **سیستۆلیک زیاتر لە**

## CIRCULATION SKILL STATION EXAM: EXTERNAL BLEEDINg CONTROL

**فشاری ڕاستەوخۆ ئەنجام بدە بۆ خوێنبەربوونی دەرەوە**

**برینێک کە قووڵ بێت و زۆر خوێنی لێ بڕوات، لەوانەیە بەئاسانیی خوێنبەربوون نەوەستێت فشاری ڕاستەوخۆ بە پەڕۆیەکی پاک بە نمونە گۆز دەتوانێت بەکاربهێنیت بۆ کەمکردنەوە یان وەستاندنی خوێنبەربوونەکە (بڕوانە وێنەکە)**

- **دەستکێش لەدەست بکە .**

- فشاری ڕاستەوخۆ بۆ خوێنبەربوونەکە ئەنجام بدە.
- بەکارهێنانی گۆز یان پارچە پەڕۆیەکی  و خاوێن کە بە پێیستەکەوە نەلکێت.
- پارچەی گەورە بەکارمەهێنە چونکە دەتوانێت فشاری پێویست لە شوێنەکەدا  سەخت بکات.
- تا دەتوانیت ڕاستەوخۆ فشاری توند بخەرە سەر سەرچاوەی خوێنبەربوونەکە، بەزۆری بە دوو یان سێ پەنجە.
- ئەگەر برینەکە لەسەر ئەندامێک بوو ئەوا ئەندامەکە بەرز بکەرەوە بۆ سەرووی دڵ.
- ئەگەر یەکەم پارچە بە خوێن تەڕ بوو، ئەوا دەری مەهێنە چونکە ئەو مەینەی دروست بووە تێک دەچێت. لەبری ئەوە پادێکی تر زیاد بکە و فشارێکی توند بخەرە سەر.
- کاتێک خوێنبەربوون وەستا، هەوڵ  بدە بۆ ئەوەی گۆز/پادەکە لە شوێنی خۆیدا جێگیر بکەیت
- ئەگەر خوێنبەربوون نەوستێت، بیر لە(deep wound packing)  یان  تورنیکێت بکەرەوە (بڕوانە بەشی داهاتوو)



Applying direct pressure to a wound

## Deep wound packing بۆ خوێنبەربوونی دەرەوە

ئەگەر برینەکە قووڵ بێت و فشارێکی سادە خوێنبەربوونەکە نەهوەستێت ڕەنگە (Deep wound packing)یارمەتیدەربێت. بەڵام(Deep wound packing) ڕێکارێکی کاتیە بۆ وەستاندنی خوێنبەربوونەکە چونکە ئەگەر بۆ زیاتر لە ٢٤ کاتژمێر وازی لێبهێنرێت و بەجێ بهێڵرێت لەوانەیە ببێتە هۆی هەوکردن.

- دەستکێش لەدەست بکە.
- هەمیشە هەڵسەنگاندن بۆ پەستانی خوێن، پڕکردنەوەی موولوولەکان و هەستکردنی نەخۆشەکە بکە  پێش و دوای بەستن یان سپلینتکردنی هەر برینێک
- برینەکە بە باشی بشۆ بە شۆردنی بە لانیکەم لیترێک ئاوی پاک (یا ئاوەکە لەبەری بڕوات ئەگەر گونجا (سەیری بەشی داهاتوو بکە)
- بەکارهێنانی گۆز یان پارچەیەکی دیکەی تری پاک بۆ ئەوەی  ناو برینەکە بە تەواوی پڕبکەیتەوە.
- گۆزی زیادە لەسەر ڕووی برینەکە بەکاربهێنە و فشاری ڕاستەوخۆ بخەرە سەر دەست یان ئەو پارچەیەی کە بە توندی بە دەوری برین/ئەندامەکەدا کە  پێچراوەتەوە.
- بۆ برینەکانی ئەندامەکان کە پێویستیان بە پاککردنەوە هەیە، سپلینتێک بەکاربهێنە بۆ کەمکردنەوەی مەترسی دووبارە خوێنبەربوون.
- نابێت بۆ زیاتر لە ٢٤ کاتژمێر لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە بەهۆی مەترسی تووشبوون بە هەوکردن.
- ئەگەر خوێنبەربوون نەوەستا، بیر لە تورنیکێت بکەرەوە (بڕوانە بەشی داهاتوو)

## تەکنیکی تورنیکێت

**تەکنیکی تورنیکێت بۆ خوێنبەربوونی دەرەکی لە حاڵەتێکدا ئەگەر نەتوانرێت بە ڕێگەکانی دیکە کۆنترۆڵ بکرێت**

**لە زۆربەی حاڵەتەکان تەکنیکەکەی تورنیکێت ئەنجام نادرێت بەڵام پێویستە وەک پەرستار بزانیت بۆ چ حاڵەتێکی مەترسیدار بۆ سەر ژیان دەکرێت بەکاربهێنرێت و ببێتە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی کەسەکە ، بێگومان ئەوەی دەبێت بیزانیت ڕەچاوکردنی تایبەت لە دەوروبەری بەکارهێنانی تورنیکێت و چاودێری بەردەوامی نەخۆشەکەیە**

**ئەم تەکنیکە تەنها لەو کاتەدا بەکاردەهێنرێت کە هەموو ڕێوشوێنەکانی تری کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوون شکستیان هێنابێت و خوێنبەربوون مەترسی لەسەر ژیان هەبێت. ئەگەر تورنیکێت ببەستی، ئەگەری ئەوە هەیە شانەکانی ژێر تورنیکێتەکە بۆ هەمیشە زیانیان پێ بگات و تەنانەت پێویستیان بە برینی بەشەکانیشی هەبێت. ئەگەر بیرت لە بەکارهێنانی کردەوە، دەستبەجێ پەیوەندی بکە بۆ یارمەتی و پلان دابنێ بۆ ڕادەستکردنەوە/گواستنەوە بۆ یەکەیەک کە توانای ئەنجامدانی نەشتەرگەری هەیە**

**ئەگەر بەردەست بوو ئەوا** (pneumatic tourniquet) **(شێوەی وەک کەفی پەستانی خوێن وایە) لەسەر پێستی داپۆشراووە ئینفلەیتی بکە تاوەکو خوێن بەربونەکە دەوەستێنیت، ئەگەر نەبوو دەتوانیت باندجێکی ئەستور یان پارچە قوماشێک یانیش قایش کە هەرچەندە ڕوبەرەکەی فراوانتر بێت باشترە بەکاربهێنە لەسەر پێستێک کە داپۆشرابێت.**

**تا دەتوانیت نزیک برینەکە بەڵام ڕاستەوخۆ لەسەە برینەکە یاخود شوێنی شکاویی مەیبەستە ئەوەندە پەستانەکە زیاد بکە کە پەڵسی نزیک شوێنەکە نەمێنێت وە بەردەوام هەڵسەنگاندن بۆ خوێن بەربونەکە بکە ئەگەر خوێنبەربوون وەستا، بەستنەکە لە شوێنی خۆیدا بەجێبهێڵە یان برینەکە ببەستە و ئامادەکاری بکە بۆ ڕادەستکردن/گواستنەوە بۆ یەکەی چاودێری نەشتەرگەری.**

**ئەگەر خوێنبەربوونەکە نەوەستا، فشاری تورنیکێت زیاد بکە تا خوێنبەربوونی سەرەکی دەوەستێت.**

- **کاتی وردی لێدانی تورنیکێتەکە لە تێبینییەکان تۆمار بکە و لەسەر پێستی نەخۆشەکە یان خودی تورنیکێتەکە بینووسە.**
- **بە زووترین کات ڕاوێژ بە دابینکەری پێشکەوتوو بکە هەرگیز با لە دوو کاتژمێر زیاتر تۆرنیکێتەکەی پێوە نەبێت**
- **پێویستە تورنیکێتەکە هەر 2 کاتژمێر جارێک بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەی 10 بکەیتەوە. لەم ماوەیەدا فشاری ڕاستەوخۆ بۆ شوێنی خوێنبەربوونەکە ڕابگرە. دووبارە تورنیکێتەکە بەکارمەهێنە مەگەر بەڵگەی بەردەوامی خوێنبەربوونی چالاک نەبوو لە شوێنەکە.**
- **شوێنی تورنیکێت: تورنیکێت تەنها لە پەلەکاندا بەکرادەهێنرێت و پێویستە لەسەرووی ئاستی خوێنبەربوونەکە دابنرێت، بەهۆی پەیوەندی نێوان ئێسک و خوێنبەرەکان، زۆرجار تورنیکێت لەسەر قۆڵ یان قاچ کاریگەرترە لە تورنیکێت کە لە ژێر قۆڵ یان ئەژنۆ**
- **دڵنیابە کە تورنیکێتەکە بە ڕوونی دیارە.**

- لەبیرت بێت تۆرنیکێت وەک دوا ڕێگا دبنێ ئەگەر تورنیکیت بەکاربهێنیت، ئەوا خوێن ڕۆشتن بۆ ئەندامەکە دەوەستێنیت،بۆیە تەنها بۆ خوێنبەربوون کە مەترسی لەسەر ژیان دروست دەکات بەکاری بهێنە.
- کاتێک بەکارهێنانی تورنیکێت زۆر پێویستە، ئەوەی بەکاری دەهێنیت با ڕووبەرەکەی تا ڕادەیەک فراوان و گونجاو بێت ، بەکاربهێنە.

## Performing uterine massage for postpartum haemorrhage

- بۆ ئافرەتەکەی ڕوون بکەرەوە کە چی دەکەیت و بۆچی ئەم کارەی بۆ ئەنجام دەدەیت
- ئامانج لێی پاڵەپەستۆکردنی منداڵدانە لە نێوان دەستت و پێکهاتە ئێسکییەکانی پشت منداڵدان.
- دەستت بخەرە سەر سکی ژنەکە لە ڕێگەی دیواری سکەوە هەست بە منداڵدان بکە و بە دەستت کوپەکەی بکە(هەست بکەیت لە ژێر دەستت دایە بە تەواوەتی) ئەمەش دڵنیای دەدات کە لە ژێر دەستتدا دەمێنێتەوە لەکاتێکدا مەساجی دەکەیت.
- تەنها کرداری گوشاندنی منداڵدان ئەنجام مەدە، بەڵکو دڵنیابە لەوەی کە فشارێکی بەهێز بەرەو پشتی نەخۆشەکە دەکەیت لەکاتی مەساجکردندا بە جووڵەیەکی بازنەیی
- منداڵدان مەساج بکە تا زۆر ڕەق دەبێت پێویستە هەست بە بەردێکی ١٠ سم لە خوارەوەی سکدا بکات کاتێک گرژ دەبێت
- مەساجکردن مەوەستێنە تا منداڵدانەکە گرژ دەبێت بە تەواوەتی
- دڵنیابە دوای وەستاندنی مەساجی منداڵدان، منداڵدان دووبارە نەرم نابێتەوە (واتە کرژبوونی نەمێنێت)، ئەگەر ڕەقیەکەی نەما بووەوە دەست بە مەساجکردن بکەرەوە
- بەردەوام هەڵسەنگاندن بۆ خوێنبەربوونی زێ بکە
- زوو زوو نیشانە زیندەگیەکان (ڤایتەڵ ساین)ئەنجام بدە.



## CIRCULATION SKILL: IV FLUID – ADMINISTRATION

IVکارامەیییەکی بنەڕەتییە کە پێویستە بۆ چارەسەرکردنی شۆک.

کەسێکی پێگەیشتوو هەر نیشانەیەکی شۆکی تێدابوو

- دوو کانولەی 14-16G بۆ بەکاربهێنە.
- ئامادەکردنی کانولا، شلەیIV ، تورنیکێت، دەستکێش، پلاستەر بۆ داپۆشینی کانولەکە و سوابی کحول.
- دەستکێش لەدەست بکە.
- باندێکی لاستیکی یان دەستکێشێک لە دەوری قۆڵەکە دابنێ بۆ ئەوەی وەک تورنیکێتێکی کاتی کاربکات بۆ یارمەتیدانی خوێنبەرەکان بۆ دەرخستنی (ئەم "تۆرنیکێتە" جیاوازە لەوەی سەرەوە و نابێت ئەوەندە توند بێت

که ڕۆیشتنی خوێنی خوێنبەرەکان بوەستێنێت). دوور بکەوەرەوە لە دانانی IV لە هەر قۆڵێکدا کە (fistula)هەبێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی گورچیلە.

- سەیرکردن و هەستکردن بە خوێنبەرێک کە ڕاست بێت،دوور بکەوەرەوە لەو خوێنبەرانەی کە پەڵسیان هەیە ئەگەر کەسێک تووشی شۆک بوو، ڕەنگە دۆزینەوەی خوێنبەرێک قورس بێت. لەم حاڵەتەدا بەدوای خوێنبەرێکدا بگەڕێ لە (Antecubital fossa).



IV in antecubital fossa

- بەکارهێنانی کحول یان پاککەرەوە کە گونجاو بێت بۆ پێست بۆ پاککردنەوەی پێستی دەوروبەری ئەو خوێنبەرەی کە پلانت هەیە کانولەکەی لێ دابنێیت
- هەرگیز کانولە لە شوێنی شکاوی یان پێستێک ئەگەری هەیە و وادەرکەوت توشی هەوکردن بوبێ دامەنێ.
- بە نەخۆشەکە بڵێ کە چی دەکەیت.
- داپۆشەری سەلامەتی لەسەر کانولەکە لابەرە (تەنها شتێک کە پێویستە بخرێتە ناوەوە دەرزییەکە
- لەگەڵ بەشە پلاستیکیەکەی کانولاکە دەرزییەکە ڕاستەوخۆ بەسەر خوێنبەرەکەدا دابنێ و بە هێڵ لەگەڵ خوێنبەرەکەدا تا دەتوانیت تەخت و هاوتەریب لەگەڵ پێستدا).
- سەیری گەڕانەوەی خوێن بۆ ناو کانولاکە بکە بکە کاتێک دەچێتە ناو(vein)ەوە.
- ئەگەر خوێن شێوازێکی ئاسایی پەمپکردنی هەبێت، بە ئەگەرێکی زۆرەوە لەوانەیە بە(Artery ) کەوتبێت و پێویستە دەرزی/کاتێتەرەکە دەربهێنیت و فشارێکی توند بخەیتە سەر شوێنەکە بۆ لانیکەم 5-10 خولەک.
- دوای بینینی گەڕانەوەی خوێن خوێن، دەرزییەکە چەند ملیمێک زیاتر بخەرە ناوەوە، پاشان کانولەی پلاستیکی بەسەر دەرزیەکەدا بە تەواوی پێشبخە بۆ ناو (vein) ی نەخۆشەکە. (کاتێک دەست دەکەیت بە جولاندنی بەشە پلاستیکیەکە مەهێڵە دەرزییەکە بەرەو پێشەوە بڕوا
- کانولەکە لە شوێنی خۆیدا ڕابگرە، فشار بخەرە سەر ئەو بەشەی کانولەکە کە سەرەتا خستمانە ناو (vein)ەکە(بۆ گیران و وەستاندنی ڕۆیشتنی خوێن) و دەرزییەکە بکێشە دەرەوە، کانولەکە لە خوێنبەرەکەدا بەجێبهێڵە ، ئەگەر پێویست بوو خوێن وەربگرە بۆ ئەوەی بنێردرێت بۆ پشکنینی تاقیگەیی.
- تورنیکێتەلە لە دەست یاب قۆڵی نەخۆشەکە لێبکەرەوە و کانولەکە وە هەوڵ بدە کەمێک نۆرماڵ سەلاین داخلی کانولەکە بکەیت.
- کەپەکە لەسەر کۆتایی کانولەکە دابنێ و کانولەکە بە باشی درێسینگ بکە و شوێنەکە بە باشی بە پلاستەر داپۆشە بەرواری دانانی کانولەکە لە تێبینییەکان تۆمار بکە واتە دۆکومێنتەیشن.
- ڵنیابە لەوەی کە دەرزییەکە لە شوێنێکی گونجاو داناوە کە مەترسی نەبێت.
- ڕۆژانە شوێنی کانولاکەت بپشکنە بۆ نیشانەکانی هەوکردن وەک سووربوونەوەی پێست، ئازار و ئاوسانی.

دڵنیابە کە کانولاکە هێشتا لە خوێنبەرەکەدایە و لە پێستی تەنیشت خوێنبەرەکەدا دانەبێت کە بوونی ئەمە وادەکات شلە بچێتە ژێر پێستەوە و ئازار و ئاوسانی دروست دەکات. ئەگەر هەر نیشانەیەکی ئاوسان یان

هەوکردن هەبوو، کانولەی IV دەربهێنە و دووبارە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەرەوە.

## Insertion of IV cannula (paediatric)

**سەرەتا هەوڵ بدە لەسەر دەستی منداڵەکە دایبنێی ئەگەر توانرا ئەگەر نەبوو دەتوانیت لەم شوێنانە دایبنێی:**
(Scalp vein, external jugular vein, antecubital vein, Femoral vein)

**کاتێک کەلوپەلەکانت ئامادەکرد داوای یارمەتی لە کەسێکی دیکە یان دایک و باوکی منداڵەکە بکە یارمەتیت بدەن لە گرتنی منداڵەکە.**




*Veins in infants*

- **هەوڵ بدە کانولەکەت**(21-23Gauge)**بێت**
- **کاتێک هەوڵ دەدەیت ڤێنەکە بدۆزیەوە دەستی منداڵەکە بچەمێنەوە بە تەواوی تاوەکو بە تەواوی دەردەکەوێت، ئەگەر پێویستی کرد تۆرنیکێت ببەستە لە سەرو ئەو شوێنەی پێویستە کانولاکەی لێ دابنێی بەڵام بیرت نەچێت دواتر بیرت نەچێت لێی بکەرەوە.**
- **کانولەکە بە هەمان تەکنیکی بەکارهاتوو لە گەورەساڵاندا دابنێ بەڵام دیسانەوە دڵنیا بە کە خوێن بە شێوەیەکی ڕەوان لە کاثێتەری کانولاکەوە دێت و پاڵەپەستۆی لەگەڵ نیە دوای دانانەکەی خوێن دەربکێشە ئەگەر بۆ پشکنینی تاقیگەیی پێویست بوو .تۆرنیکێتەکە لابە و کانولاکە بە بڕێکی کەم لە نۆرماڵ سالاین کانولەکە تاقی بکەرەوە (واتە هەوڵ بدە یەک دوو سی سی نۆرماڵ بکەیتە ناو کانولاکە)**
- **دڵنیابەرەوە لەوەی بە باشی کانولەکە جێگیر دەکەیت چونکە منداڵان زیاتر ئەگەری هەیە دەسکاری بکەن و لێی بکەنەوە هەر بۆیە هەوڵ مەدە بە تەنیا پارچە پلاستەرێک جێگیری بکەیت ، هەروەها بە یەک پارچەی درێژ بە دەوری پەلەکەیا پلاستەر مەئاڵێنە چونکە ئەگەری هەیە ڕێگری لە ڕۆشتنی خوێن بکات بۆ ئەو ناوچەیە.**
- **ئەگەر وا پێویستی کرد کانولاکە لە نزیک جومگە دابنێی وەک** (hand, antecubital fossa, femoral area)**هەوڵ بدە جومگەکە ببەستە بۆ ئەوەی نەچەمێتەوە و ڕێگری لە ڕۆیشتنی شلەی**IV**یەکە بکات لە چونە ناوەوە، و شوێنی** IV **بە سووکیی بە باندج ببەستەوە بۆ ئەوەی منداڵەکە نەتوانێت دەست لە درێسینگەکەی سەر پێستەکە بدات**
- **ڕۆژانە شوێنی** IV **بپشکنە بۆ نیشانەکانی هەوکردن وەک سووربوونەوەی پێست، ئازار و ئاوسان،دڵنیابە کە کانولەکە هێشتا لە خوێنبەرەکەدایە و لە پێستی تەنیشت**(Vein) **ەکە نیە  ڕێگە دەدات شلە بچێتە ناو پێستەوە و ئازار و ئاوسانی و سەرچاوەیەکی تری هەوکردن دروست بکا. ئەگەر هەر نیشانەیەکی هەوکردن هەبوو، کانولەی** IV **دەربهێنە و دووبارە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەرەوە**



Securing an IV in a child

Inserting IV in a small child's hand

## CIRCULATION SKILL: IV FLUID – ADJUSTING FLUID VOLUME FOR SPECIAL CONDITIONS

پێویستە شۆک بە شلەی IV چارەسەر بکرێت ،قەبارەی شلە دەبێت بۆ ئەو نەخۆشانە ڕێکبخرێت کە سێ حاڵەتیان هەیە(malnutrition, severe anemia, fluid overload)لە کاتی بەکارهێنانی شلەی IV بۆ هەر نەخۆشێک، بەدوای نیشانەکانی باری (fluid overload)بگەڕێ لەوانە: کێشەی هەناسەدان، دەنگی کراکڵ لە سیەکاندا، زیادبوونی لێدانی هەناسەدان یان زیادبوونی لێدانی دڵ. ئەگەر هەریەکێک لەم نیشانانە هەبوو شلەی IV بوەستێنە و پلان دابنێ بۆ ڕادەستکردنی دەستبەجێ بۆ دابینکەرێکی پێشکەوتوو.

ناسینەوەی ئەو حاڵەتانەی کە پێویستیان بە ڕێکخستنی شلەی IV هەیە لە نەخۆشانی تووشبوو بە شۆک

باری زۆری شلە، بەدخۆراکی، و کەمخوێنی توند(fluid overload, malnutrition, and severe anaemia)

- ئایا باری زۆری شلە(fluid overload)هەیە؟

لە هەندێک نەخۆشدا، وەک ئەوانەی دڵ یان گورچیلەیان لەکارکەوتووە، لەوانەیە شلەی زیادە لە شانەکاندا هەبێت (بۆ نموونە لە سییەکان یان شانە نەرمەکانی قاچەکاندا). ئەم نەخۆشانە لەوانەیە "fluid overload"یان هەبێت کاتێک کە پەرفیوژنیان خراپە (چونکە ئەم شلە زیادەیە لە خوێنبەرەکاندا نییە). ئەم نەخۆشانە هێشتا پێویستیان بە شلەی IV هەیە ئەگەر تووشی شۆک بوون، بەڵام دەبێت شلەی IV بە هێواشی بدرێت بە چاودێرییەکی ورد بۆ ئەوەی حاڵەتەکەیان (fluid overload)خراپتر نەبێت.

**پشکنین بۆ: نیشانەکانی باری زۆری شلە(Fluid Overload)**

سەختی هەناسەدان لەگەڵ هەبوونی دەنگی crackle لە کاتی پشکنینی سنگدا

- ئاوسانی بەشی خوارەوەی جەستە (بەزۆری لە قاچەکاندا)
- کەسەکە ناتوانێت بە تەختی پاڵ بکەوێت
- هەڵئاوسانی خوێنبەرەکانی مل(distended neck vein)

—ئەگەر نیشانەکانی باری زۆری شلە هەبوو، پێویستە شلەکان ڕێکبخەیت:

ڕەنگە سەرەتا پێویست بکات بڕێکی کەم لە شلە بدرێت (500-250 )مل بۆلۆس لە گەورەکاندا

ڕێژەی پێدانی شلە(فلود)ەکە خاو بکەرەوە.
بە وردی چاودێری بکە بۆ خراپتربوونی نیشانەکانی باری( fluid overload )زیادبوونی لێدانی هەناسەدان یان لێدانی دڵ، نەخۆشەکە لەوانەیە وردە وردە بە زەحمەت هەناسە هەڵمژێت و بیداتەوە وە زیادبوونی کراکڵ لە سنگدا یەکێکی ترە لە نیشانەکان پێویستە وریای بین
ئەگەر هەریەکێک لەم نیشانانە دەرکەوت ئەوا ڕاستەوخۆشلەکانی IV ڕابگرە.
لەبیرت بێت: گرنگە بە هێواشی بڕوات شلەکە بۆ ئەوەی بتوانیت بوەستێت لەکاتی هەبوونی نیشانە سەرەتاییەکانی باری زۆری شلە (fluid overload)
ئەگەر شلەی IV نەوەستێنیت کاتێک ئەم نیشانە سەرەتاییانە گەشە دەکەن و زیاد دەبن، زۆری شلەی IV دەبێتە هۆی پڕبوونی سییەکانی نەخۆش لە شلە و کێشەیەکی زۆر لە هەناسەدان دروست بکات، یان تەنانەت مردنیش هەندێک جار لەوانەیە ڕووبدات.

- ئایا نەخۆشەکە کەمخوێنی توندی هەیە؟واتە (Anemia)

لە نەخۆشانی کەمخوێنی توندا، شلەی IV دەتوانێت خوێن شل(تەڕ)بکاتەوە و توانای گواستنەوەی ئۆکسجین بۆ ئاستێکی مەترسیدار دابەزێنێت. سەرەڕای ئەوە، ئەو نەخۆشانەی کە کەمخوێنی توندیان هەیە، بە بەکارهێنانی شلەی IV خێراتر نیشانەکانی باری زۆری شلە نیشان دەدات و تیایندا دەردەکەوێت. لەبیرت بێت: تەنها پێویستە شلەی IV بدەیت بە کەسێک کە کەمخوێنی توندی هەیە ئەگەر نیشانەکانی شۆک هەبێت.

پشکنین بۆ: نیشانەکانی کەمخوێنی توند(Anemia)
بێ ڕەنگبوونی پێستیان یان سپی هەڵگەڕان بە تایبەت لە لەپی دەستەکانیان کە دەتوانیت بەراوردی بکەیت بە دەستەکانی خۆت، یان( mucous membrane )
•هەناسەدانی خێرا یان خێرا لێدانی دڵ
•سەرلێشێواوی یان نائارامی
هەروەها لەوانەیە نیشانەکانی سستبوونی دڵ/(Heart failure)زۆر باری شلەی(Fluid overload) هەبێت
•ئەگەر ئەم نیشانانەی کەمخوێنی توند هەبوو، پێویستە فلودەکان ڕێکبخەیت:
ڕێژەی پێدانی فلودەکە خاو بکەرەوە.
لە نزیکەوە چاودێری بکە و شلەی IV بوەستێنە لە کاتی خراپتربوونی حاڵەتەکە.
ڕادەستکردن/گواستنەوەی خێرا بۆ ناوەندێک کە توانای گواستنەوەی خوێنی هەبێت.

- ئایا نەخۆش بە توندی بەدخۆراکی( Malnutrition) هەیە؟

شلەی IV دەتوانێت ببێتە هۆی ئاوسانی مەترسیدار بۆ سەر ژیان و سستبوونی دڵ (Heart failure)لە نەخۆشانی بەدخۆراکیدا و دەبێت زۆر بە وردی ڕێکبخرێت. هەروەها نەخۆشانی بەدخۆراکی مەترسی زۆر بەرزیان هەیە بۆ دابەزینی شەکری خوێن.

پشکنین بۆ: نیشانەکانی( Malnutrition) بەدخۆراکی
- **Visible wasting**
- منداڵێک کە لاوازبوونێکی زۆری هەبێ هەبێت تەنها جەستەیەکی لاوازی نابێت و دەرناکەوێت، بەڵکو بە شێوەیەکی دیار ئێسکی لەگەڵ پێستی زۆر گەورە دەردەکەوێت بۆ جەستەی . ڕەنگە قۆڵ و قاچەکانی زۆر باریک بێت و سەری تارادەیەک گەورە دەربکەوێت بەهۆی لاوازی جەستەی.

- ئاوسانی هەردوو پێ: پێڵاو یان گۆرەویەکانی دابنێ و هەردوو پێ هەڵسەنگێنە بۆ ئاوساویی. بە پەنجەی گەورە بۆ ماوەی چەند چرکەیەک بە نەرمی سەرەوەی پێ داگرە بۆ ئەوەی بزانیت ئایا شوێنی پەنجەکەت لە شانەکاندا دەمێنێتەوە یان نا

بیرهاتنەوە

- منداڵێکی بەدخۆراکی توند لەوانەیە زۆر لاواز دەرنەکەوێت ئەگەر ئاوساویی زۆر هەبێت.
- ئەگەر ئەم نیشانانەی بەدخۆراکی توند هەبوو، پێویستە شلەمەنیەکان ڕێکبخەیت بۆ هەڵبژاردنی وردی شلە سەیری بەڕێوەبردنی شلە بکە لە شۆکدا (منداڵێک کە بەدخۆراکی توندی هەیە

شلەی زارەکی باشترە ئەگەر نەخۆشەکە توانای خواردنی هەبوو).

زیادکردنی دیکستڕۆز: شلەی دیکستڕۆزی تێدایە بەکاربهێنە یان دۆزی دیکستڕۆز لەگەڵ فلودی IV بدە.

ڕێژەی بەڕێوەبردنی شلە خاو بکەرەوە.

لە نزیکەوە چاودێری شلەکانی IV بکە و بوەستێنە بۆ هەر نیشانەیەکی باری زۆری شلە یان خراپتربوونی حاڵەتەکە بە زووترین کات بیگۆڕە بۆ پێدانی شلە لە ڕێگەی دەم.

**Visible severe wasting in a child: Assessing for bilateral oedema in severe malnutrition in children**

- پێست زۆر گەورە دەردەکەوێت بۆ لەشی منداڵەکە.
- چەوری لەسەر لەشی نییە.
- دەتوانرێت هێڵکارییەکانی پەراسووەکانی منداڵەکە ببینیت.
- نەمان و کەمبونەوەی توندی ماسولکەکانی قوڵ و قاچەکانی.
- ڕەنگە سەری تاڕادەیەک گەورە دەربکەوێت بەهۆی لاوازی جەستەی .
- پەنجەی گەورەت بەکاربهێنە بۆ ئەوەی بۆ چەند چرکەیەک بە نەرمی فشار بخەیتە سەر سەری هەر پێیەک – منداڵەکە ئاوسانی هەیە ئەگەر کاریگەری هەبوو کاتێک پەنجەی گەورەت بەرز دەکەیتەوە(واتە شوێنی پەنجەکەت لەسەر شوێنەکە دەردەکەوێت).
- لەسەر پێیەکەی تر دووبارەی بکەوە.



Assessing for pitting edema in children with malnutrition

Visible severe wasting in a child

- **بەڕێوەبردن ، و پێدانی شلە بۆ حاڵەتی شۆک لە گەورەکاندا**
- **گیراوەی** Normal saline **یان** Lactated Ringer's **لە ڕێگەی کانولا پێی دەدرێت.**
- **لە گەورەکاندا 1 لیتر لە ماوەی کەمتر لە 30 خولەکدا پێویستە پێی بدرێت.**
- **هەڵسەنگاندن بکە بۆ وەڵامدانەوە بۆ شلە ڕاستەوخۆ دوای بۆلۆسی یەکەم**
- **هەڵسەنگاندنی پەرفیوژن ( پڕکردنەوەی موولوولەکان یان کاپیلەری ریفیل، باری دەروونی، دەرچوونی میز)، و پشکنینی لێدانی خوێن و پەستانی خوێن. ئەگەر باشتر بوو، پێویستە ڕێژەی لێدانی دڵ یان پەڵس دابەزێت و پەستانی خوێن بەرزبێتەوە. هەروەها ڕەنگە باری دەروونی باشتر بێت.**
- **هەڵسەنگاندن بۆ باری زۆری شلە (**fluid overload**) بکە**
- **ئەگەر هێشتا لە شۆکدا بوو نەخۆشەکەت و هیچ بەڵگەیەک لەسەر باری زۆری شلە** fluid overload **نەبوو، 1 لیتری تری بۆلۆسی پێ بدە.**
- **ئەگەر هێشتا لە شۆکدا بوو دوای 2 لیتر شلەی** IV **، دووبارە هەڵسەنگاندن بۆ خوێن بەربون یان لەدەستدانی خوێنی بەردەوام (دەرەوە و ناوەوە) یان بریندار‌بوونی بڕبڕەی پشت بکە، و داوای دابینکەری پیشکەوتوو بکە.**
- **ئەگەر بەڵگەی بەدخۆراکی توند، کەمخوێنی توند یان باری زۆری شلە(**fluid overload**) هەبێت:**
- **ئەو نەخۆشانەی کە شۆکیان هەیە هێشتا پێویستیان بە شلەی** IV **هەیە، بەڵام گرنگە زۆرجار هەڵسەنگاندن بۆ نیشانەکانی خراپتربوونی باری زیادە (**fluid overload**)بکرێتەوە.**
- **بۆ ئەم نەخۆشە پێگەیشتوانەی کە مەترسی زۆریان لەسەرە بۆ باری زۆری شلە(**fluid overload**)، لە سەرەتادا بە 500 مل شلەی** IV **بۆلۆس پێ بدرێت، پاشان هەڵسەنگاندن بکەنەوە. ئەگەر هیچ نیشانەیەکی زیادەڕۆیی شلە یان بوونی شلە لە سییەکاندا نەبوو، 500 مل ی تری بۆ زیاد بکە.**

**بەڕێوەبردن و پێدانی شلە بۆ شۆک لە منداڵان**

**بڕی گونجاوی شلە بۆ منداڵان مشتومڕی زۆری لەسەر بە لەبەرچاوگرتنی بەڵگەکانی ئەم دواییە کە شلەی بۆلۆس دەتوانێت دەرەنجامەکان لە هەندێک لە منداڵاندا خراپتر بکات. سەرەڕای ئەوە، پێوەرە پەیوەندیدارەکان بۆ خراپی پەرفیوژن و شۆک لەوانەیە بە پێی چوارچێوە جیاواز بن. ڕێنماییەکانی ساڵی ٢٠١٦ی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بۆ چاودێریکردنی منداڵان بوونی سێ تایبەتمەندی کلینیکی بەکاردەهێنن بۆ پێناسەکردنی شۆک لە منداڵاندا کە پێویستی بە بۆلۆس فلود هەیە وەک ( ساردی لە پەلەکان، کاپیلەری ریفیل زیاتر بێت لە سێ چرکە، پەڵسی لاواز و خێرا)**

- **بۆ ئەو منداڵانەی کە پەرفیوژنیان خراپە کە بەهۆی لەدەستدانی شلەیەوەیە، وەک ئەوانەی خوێنبەربوون، سووتان یان سکچوون/ڕشانەوەیەکی توندیان هەیە، شلەی بۆلۆس پێشنیار دەکرێت.**
- **بۆ ئەو منداڵانەی تر کە بەڵگەی خراپی پەرفیوژنیان هەیە، ڕەنگە بڕێکی کەمتر لە شلەمەنیەکان کە بە هێواشیتر بدرێت سەلامەتتر بێت. هەندێک نیشانەی کلینیکی دیکە هەیە کە پێویستە لەبەرچاوبگیرێت**
- **بۆ پێدانی شلەی** IV **بە منداڵێک کە لە شۆکدایە بەبێ بەدخۆراکی توند، کەمخوێنی توند یان** fluid overload **پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە ئەنجام بدەیت:**
- **کانولەی** IV **وەک لە سەرەوە باسکراوە دابنێ.**
- **کێشی منداڵەکە بکێشە یان داوای کێشی ئەم دواییە لە دایک و باوک بکە.**

- Normal salineیانLactated Ringer’s بدە: 10-20 مل بۆ هەر کیلۆگرامێک لە کێشی جەستە لە ماوەی 30 خولەکدا.
- دووبارە هەڵسەنگاندن بۆ منداڵەکە بکەرەوە دوای یەکەم ئینفیوژن.
- ئەگەر هیچ باشتربوونێک نەبوو ئەوا 10 مل بۆ هەر کیلۆگرامێک لە کێشی لەش بۆ ماوەی 30 خولەک دووبارە بکەرەوە.
- پەیوەندی بکەن بۆ یارمەتی و پلاندانان بۆ ڕادەستکردنی بە داینێکەر و یەکەیەکی پێشکەوتوو کە توانای گواستنەوەی خوێنی هەبێت.
- شلەی IV بۆ منداڵێک کە تووشی شۆک بووە لەگەڵ بەدخۆراکی توند.
- ئەو منداڵانەی کە تووشی شۆک بوون و بەدخۆراکییەکی توندیان هەیە پێویستیان بە شلەی تایبەتمەند هەیە (ئەگەر بەردەست بێت) بە ڕێژەی جیاوازی ئینفیوژن. ئەو منداڵانەی تووشی بەدخۆراکی توند و شۆک بوون مەترس زۆریان لەسەرە بۆ دابەزینی شەکری خوێن و پێویستی بە شەکر دەبێت جگە لە شلەمەنیەکان.
[بڕوانە دەرمانەکان] ئەگەر منداڵەکە توانی شلەی زارەکی بخوات، ReSoMal پێویستە وەربگرێت) بەڵام ئەگەر منداڵەکە بەهۆی کۆلێرا تووشی شۆک بووبێت، ئەوا ORSبەکاربهێنە ئەگەر منداڵەکە بێهێز بوو، بێهۆش بوو یان توانای خواردنی شلەی نەبوو یان دەم و ددان نەبوو، ئەوا شلەی لە ڕێگەی iv پێ بدە).

هۆشیاری! بەڕێوەبردنی شلە ئەگەری هەیە مەترسیدار بێت لە منداڵانی بەدخۆراکیدا. لەکاتی پێدانی شلە بە هەر شێوەیەک بێت، پێویستە هەر 5 خولەک جارێک پشکنین بۆ ئەم نیشانە مەترسیدارانە بکەیت: DIBی نوێ یان خراپتر، زیادبوونی ڕێژەی هەناسەدان >5 لە خولەکێکدا یان زیادبوونی لێدانی دڵ >15 لێدان لە خولەکێکدا. ئەگەر هەر نیشانەیەکی مەترسیدار دروست بوو شلەمەنیەکان بوەستێنە

- ئای ڤی لاین وەک لە سەرەوە باسکراوە داینێ
- کێشی منداڵەکە بکێشە.
- 10-15مل بۆ هەر کیلۆگرامێک شلەی IV لە ماوەی 1 کاتژمێردا پێ بدە ئەگەر شلەی تایبەتمەند بەردەست بوو، بەپێی بەردەستبوونی یەکێک لەمانەی خوارەوە بدە:
- لاکتاتی رینگەر لەگەڵ 5% گلوکۆز (دێکترۆز)
- گیراوەی نیوە بەهێزی Darrow’s لەگەڵ 5% گلوکۆز(dextrose) .
- 0.45%نۆرماڵ سەلاین لەگەڵ 5% گلوکۆز (دێکترۆز).
- ئەگەر شلەی دیکسترۆزت نەبوو، ئەوا یەکێک لەمانەی خوارەوە بدە:
- (Ringer lactate) و دۆزی جیاوازی زارەکی یان IV لە دیکسترۆزی بدە (بڕوانە دەرمانەکان).
- (Normal saline) و ژەمی جیاوازی زارەکی یان IV لە دیکسترۆز بدە(بڕوانە دەرمانەکان).
- دووبارە هەڵسەنگاندن بۆ منداڵەکە بکەرەوە دوای ٥-١٠ خولەکی یەکەمی ئینفیوژنەکە و پاشان هەر ٥ خولەک جارێک:
- ئەگەر منداڵەکە لە کاتی وەرگرتنی فلودەکە حاڵی خراپتر بوو (زیادبوونی سەختی هەناسەدان، ڕێژەی هەناسەدان زیادی کرد)

بە 5/خولەکی یەکەم هەناسەدانی کەسەکە زیاد دەکات و پەڵس ڕەیت بە ماوەی 15/خولەک زیاد دەکات یان کراکڵ لە سییەکان گەشە دەکات:

- وەستاندنی فلودەکان.

